پێشکەش بە

هەموو ئەوانەی تێدەکۆشن بۆ نەمانی چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ. . .

## پێشەکی

دەشێت ئەم تێکستە بە پرۆژەیەکی جدی بزانین، بۆ کرانەوەی گفتوگۆیەکی بابەتیانە و ڕادیکالانە، لەسەر ئەو مەسەلانەی کەزیاد لە دید و تێڕوانین و خوێندنەوەیەك هەڵدەگرێت، ئەم پرۆژانە گەرچی لە سەرەتادان، بەڵام گەر تەندروستانە ئەکتیڤبکرێت لە پانتایی و فەزای ڕۆشنبیری و سیاسی و فکری کوردیدا، ئەوا دەبێت ڕاچڵەکاندنێك بۆ هەموو ئەو تێکستانەی چەندین گریمانە و ئەگەر و خوێندنەوەی نا واقعیانە بەرهەم دەهێنن و خودی واقعیش تێدەپەڕێنن و بەرەو جۆرێك تەفسیری نازانستی و یۆتۆپی بەریەك دەکەون.. ڕاستیەکەی ئەمە کێشەی هەر ڕۆشنبیرییەکە نەتوانێ کێشە واقعیەکانی خۆی شیکار پێبدات و بەزمانێکی خەیاڵیانە واقع هەڵدەسەنگێنێت، بە ئارەزووی خۆیان یەکە یەکەی دیاردەو ڕووداو و حاڵەتەکان بەیەکتریەوە دەبەستنەوە.

لەنێوان تێڕوانینەکانی ئەم دەقە و تێڕوانینەکانی (کاك بەختیار عەلی)دا دوو خوێندنەوەی سەربەخۆ و پڕ لە جیاوازی دەبینرێن، کە ئەمەش حاڵەتی ئیستاتیکای ئەم گفتوگۆیەی نێوانیانە. بە دیوی دووەمدا ئەوەی لەم دەقەدا دەبێتە غەمی بنەڕەتی قسەکردنە لەسەر بەرهەم هێنانی گوتارێك لەناو پرۆژەی ڕەخنەدا، ڕەخنەیەك وامان لێدەکات هەڵوێستەیەك لەبەرامبەر ئەرکە سەرەکییەکانی ڕۆشنبیردا بکەین، هەڵوێستەیەك وام لێبکات بە دیدێکی تر و لە ڕوانگەیەکی ترەوە، ڕووداوەکان هەڵبسەنگێنین و شیکاریان بکەین، دواهەمین تەفسیر گەر زۆر بەهێزو خاوەن زمانەوانی و شارەزاییەکی پارادیم و تێرمەکانیش بێت، نەبێتە کۆتایی تەفسیرەکان و ڕازی نەبین بەو شیکارانەی لە دوا دەرئەنجامدا بەرەو موتڵەگەرایەکی ئەبستراکتمان بەرێت.

ئیشکردنی ئەم دوو تێکستە بۆ ئەوەی، بە شێوازێکی جیاواز لە زمانی شەفەهی و ڕۆژانە قسە لەسەر ڕووداوەکان، چەمکەکان، تەفسیرەکان.. بکەین، ئەم ئیشکردنەوەیە بۆ ئەوەیە بەشوێن تەفسیری بونیادانەی ڕووداوەکاندا بگەڕێین لە سەرچاوە بنەڕەتیەکانەوە خوێندنەوەی ستراتیژیانەی بابەتەکان دیارییبکەین.. دەبێت باوەڕ بەوە بکەین کە هەموو گوتارێك لە ناواخندا هەموو شتێك نالێت و لە ناواخندا کۆمەڵێك نهێنی نەگوتراو لە خۆدا حەشار دەدات.. گەڕانەوە بۆ کەشفکردنی ئەو نهێنیانە، گەڕانەوەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ ناو واقع و فەزای دەق.. ئەم پرۆسەیە نەك دوو خوێندنەوە، بەڵکە دەیان خوێندنەوەی جیاواز بەرهەم دەهێنێت چونکە لە کۆتایدا کۆمەڵێك شت هەیە کە بە نهێنی دەمێنێتەوە.

ئەو پرسیارانەی بەنهێنی بەناو ئەم دیالۆگەدا تێپەڕدەبێت و هەر بەنهێنیش دەمێنێتەوە، پرسیارە لە شکڵی تەفسیرە ئەفسانەییەکان لە بەرامبەر مەنهەجی تەفسیرە واقعیەکاندا، خوێندنەوە و تیۆریزەکردنی پرۆژەی هیومانیستیەکانە بەرامبەر پرۆژە ترسناکەکانی تیرۆریستەکاندا، پرسیارە لە ستراتیژەکانی نامۆبوون و غیابی ڕۆشنبیران لە ناو گەرمەی ڕووداو و کارەسات و گۆڕانکاریەکاندا.. ئەم دوالیزمانە ساتێك دەتوانین بە شوێن شکڵ و فۆرمە جیاوازەکاندا بگەڕێین و پرسیار ئاراستەی بوون و ماهیەتیان بکەین ، کە پابەندیان بکەن بە کێشەکانی گلۆبەلایزەیشن و لۆکالایزەیشن، پەیوەستی بکەین بە بەرنامە سیاسیەکان و کاری سیاسەتمەداری بێلایەن.

دواتر کێشەکان بونیادانە وردبکەینەوە ، لە نێوان دوو دنیادا، دوونیای تێکەڵاو بە کاریگەری یەکتر، ئەوانیش دنیای پرۆژەکانی مۆدێرنە و مەدەنیەت و

شارستانیەتی کەلتورە جیاوازەکان، لە بەرامبەر دنیای تەقسی ترادسیۆنە دینی و خێڵەکی و پەراوێزکراوەکاندا.. دەبێت بەشوێن شەڕی نێوان ئەم دوو دنیایەدا بگەڕێین.. شەڕێك کە گلۆبەلایزەیشن هێندە سەنگەرەکانی لەیەکتر نزیك کدوونەتەوە، شەڕە لەنێوان دوو تێزی کارکردن لەسیاسەت و بەرژەوەندی و زانیاری و مۆنۆپۆڵکردندا. ئەم شەڕە بەهەر بارێکدا بشکێتەوە بەهاکانی مرۆڤایەتی و مۆدێرنەو دیموکراسی و ئازادی ...تاد دەخاتە مەترسیەوە، دواتر تەنها ڕووخسارە سارد و سڕەکان دەبینین.. بۆیە ئەرکی هەموانە بەسیاسی و ڕۆشنبیر و هێز و گروپەکانەوە هەوڵی سەر لە نوێ پیادا چوونەوە و خوێندنەوەی دیاردەکان بدەین.. لەبەر هیچ لەبەر ئازادی .. چونکە ئەرکی پاراستنی ئازادی بەتەنها لە گەردنی ئەو کەسانەدا نیە کە بەناوی ئازادیەوە خەبات دەکەن و دەجەنگێن، گەر ئازادی بەتەنها بە پێوانەی ئەوان بێت، ئەوا پرۆسەکانی بەدیهێنانی ئازادی لەشوێنێکدا دەخنکێنێت کە لووتکەی خەباتکاران و پارێزەرەکانێتی.

ئازادی پرۆسەیەکە زۆر بەناسکی دەمێنێتەوە.. ئەوە ڕۆشنبیر و دەستەبژێرەکانە دەبێت پاریزەری بەهاو خواست و گریمانە بنەڕەتیەکانی ئازادی بن.. بەلام ئەوە گەورەترین وەهمە کە ئەوان وابزانن بەهاو مانا و جوانیەکانی ئازادی بەتەنها لە خوێندنەوە و ڕەخنەکانی ئەواندا دەردەکەوێت و نەشونما دەکات.

لەبەردەم پرۆژەی مەعریفی و تەکنەلۆژی و سیاسی.. پیاوانی پەیامی هیومانیستی و کار و جوڵە و هێرشەکانی پیاوانی تیرۆریستیدا، دەبێت ئیستێك بکەین.. بەلام ئیستێکی پڕ لە گومان، ئەو گومانەی وامان لێدەکات لە قولایی

پرۆژەی پیاوانی هیومانیستیدا بۆ تیرۆر بگەڕێین و لە جەوروستەمی تیرۆریستەکاندا بەدوای قوربانیەکاندا بگەڕێین.. لەناو کتێب و تێکستەکاندا بەشوێن وەهم و سەرلێشێواویدا بگەڕێین.. ئەمە قەدەری ئەو جەنگانەیە کە شووشەی هەموو ماڵێك دەگرێتەوە.. سووتەمەنی ئاگری ئەو شەڕانەیە کە بە هەموو جیهاندا لۆکاڵیزەکراوە.. بەکورتی ئەم گفتوگۆیە لەناو پرۆژە و ستراتیژی ڕەخنەدا لە دایك بووە بەهەردوو بارەکەدا ڕەخنەیە.. واتەکاری ڕەخنەییە لە ڕەخنەگرتن.

مەریوان عەلی

لە ژمارە (٤٤) و (٤٥) ی هەفتەنامەی هاوڵاتیدا کاك بەختیار عەلی نوسینێکی بڵاوکردوەتەوە لە ژێر ناونیشانی ئەزموونی دارستان و ئەزموونی دیموکراسیەت. ئەو نوسینەی لێرادا دەمەوێت لە کەمێکی بدوێم، بریتیە لە لێکۆڵینەوەیەکی تاڵ سەریارەت بە دیدی بەختیار عەلی پاش یانزەی سێپتەمبەر و کردەوەکانی گرۆ ئیسلامیە توندڕەوەکان (بە نمونەش جوندولئیسلام، تالیبان،...هتد)، هەروەها وەبیرهێنانەوەیەکە بۆ ئەو دەستە هەڵبژاردەیەی کە ماوەی پتر لە پێنج ساڵە کاریگەریان وەك پێویست نەبووە لەسەر شانۆی ڕووداوەکان سەبارەت بە واقعەکانی ڕابردووی کوردستان و دەرەوەی کوردستان.

پێشەکی پێم خۆشە ئەوە بڵێم کە بەنیاز بووم ئەم نوسینە لە هەمان هەفتەنامەدا بڵاو بکەمەوە بۆ ئەوەی بە ڕێگایەکی ئاسانتر بگاتە دەست خوێنەری بەڕێز. بەڵام بەداخەوە ئەوە نەکرا لە بەر هەندێ هۆکار کەیەکێك لەوانە، ئەوە بوو پێویست بوو لایەنی کەم بە چوار بەش بڵاویکرێتەوە و ئەمەش بۆ هەفتەنامەکە دەستی نەدەدا، هەروەها لە ڕووی قەبارەشەوە دەبوو دەستکاریەکی بکەم تا بگونجێت ئەمەش بۆخۆی دەبووە هۆکارێك بۆ دەستکاریکردنی ناوەڕۆکی نوسینەکە و لەدەست دانی هەندێ لە پەرەگرافە گرنگەکانی کە بەدیدی من پێویستە هەمووی بۆ خوێنەر و ڕۆشنبیرەکان بڵاو بکەمەوە.

لە هەمان کاتدا نوسینەکە لە ڕووی قەبارەوە بەرەو نامیلکەیەکی بچکۆلانە سەر پێکەوت کە زۆر دەمێك بوو خوازیار بووم لەسەر ئەرکی ڕۆشنبیری بگۆڕ ئەو ڕاو

بۆچوونانە لە چەند وتارێکدا یان چەند کۆڕ و سیمینارێکدا بڵاو بکەمەوە. لە ڕاستیدا نەبوونی کات و دەرفەت، بەهۆی کاری عەمەلیەوە، تاکە ڕێگری سەرەکی بووە لە بەردەم ئەم سەرنجانەدا. سەرەڕای ئەم ڕوونکردنەوەیەش زۆر کات کە لە گەڵ نوسەری بەڕێز بەختیار عەلیدا دەدوێم بەتەنها مەبەستم بەختیار نیە وەك نووسین، بەڵکو زۆری تر لە ڕۆشنبیرەکانی ئەم دونیایەی ئێمە لەسەر هەمان تەوەرە و قوتابخانەی ڕەخنەیی ڕێدەکەن. لە ڕاستیدا بەدیدی من بواری ڕۆشنبیری و بەتایبەت ڕۆشنبیری سیاسی کارێکە زۆر زیاتر پێویستی بە پراکتیك و کارنامەی عەمەلی هەیە وەك لە بواری تیۆری، چونکە وەك هەموو بوارێکی تری ژیان و لە هەمووشیان زیندووتر، خوازراوە کە ڕەخنەگرتن و چاوپیاخشاندنەوەی بارودۆخی کۆمەڵ لە بواری تاقیکاریدا خۆی بسەلمێنێت.

با بزانین گلۆبالیزم فۆرمێکە بۆ ژیانی سەردەم؟ سیستەمێکی سیاسی پاش جەنگی ساردە؟ سیستەمێکی دێرینی باوە لە دونیای فکرو پراکتیکی سیاسیدا؟ یان بەرئەنجامی گەشەکردن و قۆناغێکی نوێی سەرمایەداری و ئیمپریالیزمی جیهانیە؟

سەرەتا گلۆبەلایزەیشن لە دیدگایەکی ئابووریەوە دەخوێنینەوە کە سەرچاوە و بزوێنەری پرۆسە و قۆناغەکەیە، بەپێی ئەم زانستەش (بریتیە لە گۆڕینی ئابووریە ناوخۆییەکان بە ئابووریەکی جیهانی، کە ئەمەیش جووڵانەوەیەکی ئازادانەو خێرای چالاکی ئاڵوگۆڕی دارایی و بازرگانییە جیهانییەکان دەگرێتەوە، کە سنوورو بەربەستەکان و گومرگ رادەماڵێ و دەرگا بۆ گواستنەوەی ئازادانەی سەرمایە و گواستنەوەی شمەك والاّ دەکات. ئینتەرنێت و بازرگانی کردنی لە میانەی تۆڕەکانی، دیاردەیەکی زیندووی ئەم ئابوورییە جیهانییە نوێیەیە. بەواتایەکی تر، بە جیهانیبوونی سەرمایەو پرۆسەی بەرهەمهێنان) (١).

سەرئەنجامی ئەو خەونانەی سەبارەت بە گلۆبەلایزەیشن لە لای بەختیار عەلی و زۆر لە رۆشنبیرەکانی کوردستان و خۆر ئاوای بەدی دەکەم پێی دەچێت وتەکەی فکتۆر هیگۆ راست بێت کە دەڵێت: (راستی باشەرۆژ یۆتۆبیایە).

گلۆبەلایزەیشن چەند خوێندنەوەی بۆبکرێت ناتوانرێت لەوە قورتار بکرێت کە گلۆبەلایزەیشن پرۆسەیەکی سیاسیە، بۆ مامەڵەکردن لە گەڵ جیهاندا وەك یەکەیەکی کارتێکراو و پەیوەندیدار بە یەکدیەوە، تا بتوانێت بەشەکان لەدەوری دیاردەسیاسیەکان کۆبکاتەوە و پەلکێشیان بکات بۆ کارتێکردنی سیاسی و ئەو

ستراتیژه هاویەشەی کە خوازراوه. بەڵام ئەم کارتێکردن و ستراتیژە لە بەرژەوەندی و بە دیدی کێ؟

گلۆبەلایزەیشن چەمکێکە لە کۆنەوە کاری پێکراوە، و ئەمڕۆ زەقکراوەتەوە، بە زانستیکردنی ئەو پراکتیکە سیاسیەش بەرئەنجامی ئەو بەرنامەڕێژیەیە کە لە دونیای پاش جەنگی ساردەوە بە شێوەیەکی سیستەماتیك لەسەر ئاستی جیاجیا کاری پێدەکرێت. چ جای ئەو ئاستانە ناوخۆیی بن یان گلۆباڵی، ئەمەش بۆ خۆی پشت دەبەستێت بە توانای مەعریفی و کلتوری و سیاسی و تەکنەلۆژی بەکارهێنەکانیەوە. هەر لە کۆنەوە گلۆبەلایزەیشن یەکێکە لە کاراکتەرەکانی فکرە زیندوەکانی مرۆڤایەتی، بەڵام کاتێك کە ئەم کاراکتەرە دەبێتە سیما و ڕوخساری جموجوڵێکی ئابووری و تەکنەلۆژی، دەبێت بزانین، لە دونیای سیاسی و بەرژەوەندیەکانی دەسەڵاتدا چۆن بە عەمەلی بەکاردێت، هەروەها لە لای ڕۆشنبیرەکان چۆن خەون و یۆتۆبیای لەسەر بونیاد دەنرێت. ئەمەش بۆ ئەوەنیە ڕۆڵی ڕۆشنبیرەکان بچوك بکەینەوە و هەموو دەرفەتەکانیش فراوانتر بکەین بۆ ئەوانەی پەراوەی دەسەڵات دەکەن، بەڵکودەمەوێت بڵێم کە ئەرکی ڕۆشنبیرەکان بە تەنها بریتی نیە لە ڕەخنەگرتن و کەنارگیری و تەماشکردن.

لەپاش لاسەنگ بوونی پارسەنگی هاوکێشەی سیاسی و سەربازی و ئابووری نێوان ناتۆ و وارشۆ و پاشکۆکانیان لەپاش جەنگی ساردەوە، هەروەها لە ئەنجامی ئەو پەرەسەندنە تەکنەلۆژیەی کە دونیای سەرمایە بە خۆوەی بینی لە دوو دەهەی ڕابردوودا، پێویستیەك هاتەگۆڕێ بۆ گلۆباڵیزە کردنی سەرمایە و تەکنەلۆژیایی پەیوەندیی و گواستنەوە، بۆ کارئاسانی ئەم گلۆبالیزەیەش

پێویستیەکی زۆری بە گلۆبالیزەی ڕۆشنبیریش هەبوو. کە هاوتەریب لە گەڵ خۆیدا پەلکێشی دونیای پراکتیکی سیاسی و سەرمایەگوزاریەکانی بکات لە هەموو دونیادا. لەکاتێکدا کە باکگراوندیی فەلسەفەیی سیاسی ڕۆژئاوا لە خولیای نیولیبرالیزمدا دەگەڕێت و لە ڕووی سیاسیشەوە بانگەشە بۆ دیموکراسی دەکات، گلۆبالێزمیش جەخت لە نوێکردنەوە، Modernity، و پشت بە یەکتربەستن، Inter-dependence، دەکات. جارێکی تر ئەم خولیا دیموکراسی و ئازادی خوازانە یە بووەوە بە سوتەمەنی زەقکردنەوەی ڕەوتی گلۆبەلایزەیشنی نوێ، چونکە نوێکردنەوەی تەکنەلۆژیا و بەرهەمە ئابووریە نوێیەکان لەسەر دەستی وڵاتە پێشکەوتووەکان بەرهەم دەهێنرێتەوە و هەمیشەش بەرە لاوازەکان پشت بە بەرەی بەهێز دەبەستن. هەروەها ئەم ڕەوتە تەواوی دنگەکانی لەسەر پەرەسەندنی بێشوماری تەکنەلۆژیا و زانیاری بونیادناوە. بۆیە لە ناخی خودی گلۆبەلایزەیشندا دوو دژی هەمان ستراکچەر سەرچاوە دەگرن و لە بواری سیاسیدا هەنگاوی پراکتیکیانەیان لەسەر هەڵدەگیرێت، ئەوانەش دیدگای نیولیبرالیزم کە هەوڵی پشت بەستن بەیەکێتی نێوان سەرمایەدارانی دەوڵەتەکان و بەربەرەکانی ئاشتیانە و ئازادی بازاڕ لە دونیادا دەدات لە لایەك و دیدگای رادیکالیزمی سەرمایەداری کە هەوڵی زیاترین جیهان سەرداری دەدات بە پشت بەستن بە بازاڕی ئازاد و تەکنەلۆژیای سەربازی لە لای دووەم.

لە لاسەنگ بوونی هاوکێشەی پێشووەوە و بەر لە پارسەنگ بوونی هێز، فکرێکی تر لە فکرەکانی دونیای گلۆباڵ ئیسلامە و بووە. پاشان دەرئەنجامی جیاوازی بەرژەوەندی و جیاوازی جیهان بینی لە لای ڕۆژئاوای نیولیبراڵ و ڕۆژهەڵاتی مەزهەبە جیاجیاکاندا، جیاوازی بەتەنها بە جیاوازی تیۆری نەمایەوە

بەڵکو لە هەمان کاتدا جیاوازی کاری سیاسی و پراکتیکی کارایانەی ئەو دوو ڕەوتە جیهانیە و سەرئەنجامی بەرژەوەندیە ئابووری و دەسەڵاتگەرانەکانیان بەرەو جەنگ چالاکیەکانیان گواستەوە. لە چوارچێوەی ئەم واقعە سیاسیەدا و ئەنجامی تیوری نەکردن و دوورکەوتنەوەی هیومانیستەکان لە کاری سیاسی و پراکتیکی بە تەکنەکۆژیای سیاسی سەردەم، یەکێك بوو لە هۆکارەکانی قۆزاخە خواردنی ڕۆشنبیرەکان و نەبوونی کاریگەریان لەسەر پێشهاتە سیاسیەکان. چونکە ئەوەندەی بەرنامە سیاسیەکان لەڕووی پراکتیکەوە هاوتەریبن بە بەرنامە ئابووریەکان ئەوەندە بەرنامە ڕۆشنگەریەکان تەك و لۆن بەرامبەر بە هەمان بەرنامە. ئالێرەدا تەنها و تەنها شەڕەکان دەبنە شەڕی نێوان هێزە بەرژەوەندی دارەکان و نا ئامادەیی تیۆریست و پراکتیشنی هیومانیستیش دەرفەت ئاوەڵا دەکات لە بەردەم کادرە ناوەندیەکان و ڕۆشنبیرە هامشیەکاندا کە شوێن ڕەوتە باو و باڵاکان بکەون لەسەر ئاستی گلۆباڵ و لەسەر ئاستە ناوخۆییە جیاجیاکان بەشێوەی هەمەجۆر کە پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین کە لە ڕابردووەوە خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی جیاوازی خۆیان زەبەلاح دەکەنەوە.

لەژێر کاریگەری بازاڕی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری گلۆبەلایزەیشندا و پاش لاواز بوونی بیری سۆسیالیستی سێ دامەزراوەی گرنگ کەوتوونەتە ژێر هەڕەشەوە، خێزان، دامەزراوە ئاینیەکان، هەروەها حکومەتە نیشتمانیەکان. بۆیە نیولیبرالیزم پەنهانانە کاردەکات بۆ لابردن و گۆڕینی ئەم دامەزراوانە لەسەر ئاستی گرژەنە. گلۆبالیستەکان ڕایان وایە کە:

لەسەر ئاستی خێزان: باوان هەڵدەستن بە گواستنەوەی بەها کۆمەڵایەتی و کلتوری و ڕۆحیەکان بۆ منداڵەکانیان. زۆر لەم بیرۆکانە وەك باوەڕ وەك ئاین،

کاری زۆر گران و دژ بە گلۆبەلایزەیشنن. بۆیە گلۆبەلایزەیشن لە خۆیدا خێزانی ئەمریکی بە دوژمن دەزانێت نەك هاورێ جا بە حاڵی خێزانی رۆژهەلاتی کە خاوەنی سەرچاوە و کلتورێکە زۆربەی ئاینەکانی تیادا لە دایك بووە. ئەمە کاری سەرمایەداری نوێیە و هەرگیز لە لای کلتوری ئیسلامی قابیلی قبولْ نیە. ئەوەی کە دەوڵەتی ئەمریکی ئەنجامی دەدات بۆ سەرمایەداری بەبیرۆکەی نیولیبرالیزمەوە ئەرکەکانیتی لە بەرامبەر قۆناغێکی گواستنەوەییدا، انتقالی.

لەسەر ئاستی ئاین: لە بەر ئەوەی کە ئاینەکان باوەڕیان بە رەهایی کتێبە پیرۆزەکان هەیە، لەژێر هەر تەفسیرێکدا بێت، ئەوا گلۆبالیستەکان بە مەترسی سەردەمی خۆیانی لە قەڵەم دەدەن و لە ڕاستیشدا کۆسپە لە بەردەم پلانەکانیاندا. لە تەرازووی بەرامبەردا ئیسلامەکان هەوڵی گلۆباڵیزەکردنی ئاینی ئیسلامی دەدەن. چونکە ئەمانیش باوەڕیان بە جیهانێکی یەك دەوڵەت هەیە کە ئاینی ئیسلام تیایدا حاکم بێت. گەر تێبینی بکەین هیچ کام لەم دوو ڕەوتە ڕەتی ئازادی ڕاو جیاوازیەکان ناکەن، بەڵام تەنها ڕەت نەکردنەوەی ڕاکانە نەك ڕەت نەکردنەوەی کاریگەریی ڕاکان بێت. ئەوەی شایەنی باسە نە ئیسلامەکان و نە ڕێکخراوە سیاسیەکانیان ئازادی سێکسی و قازانجی بانکەکانیان پێ قبووڵە لە هیچ شوێنێکی دونیادا وە نە سەرمایەداری و نە دەوڵەتە بەرژەوەندیدارەکانیشی قەدەغەکردنی ئینتەرنێت و کەناڵەکانی سەتەلایتیان پێ قبولە لە هیچ شوێنێکی دونیادا.

گلۆباڵیستەکان دەڵێن، (ئەو منداڵەی لە تەمەنی پێنج ساڵیەوە لە خێزان و پەروەردەکانی دەهێنرێتە بەر خوێندن منداڵێکی مێشك نەخۆش دەردەچێت و هەرگیز فێری یەك جیهانی نابێت و نابێتە ئەندامێکی تەندروست لە ژیاندا).

ئیسلامەکانیش دەڵێن، (ئەو منداڵەی دەچێتە مەکتەبە غەیرە دینیەکان، ڕۆحی گلاو دەبێت و فێری تەعالیمە ئاینیەکان نابێت).

لەسەر ئاستی وڵاتی نیشتمانی: باکمینستر فوولەر کەیەکێکە لە تیۆریستەکانی گلۆبەلایزەیشن دەڵێت، (ناسیۆنالیست و دەوڵەتی نیشتمانی ئەو کلۆ خوێنەیە کە شادەمارەکانی دڵی دونیای گرتووە). لە هەمان کاتدا لە لای ڕەوتە ئاینیەکانیش هیچ سنوورێکی نیشتمانی نیە بۆ خەبات کردن لە ڕێی خواو بە ئیسلامیکردن یان مەسیحیکردنی سیستەمەکانی حوکمدا.

لە ڕاستیدا گلۆبەلایزەیشن زاراوەیەکی نوێی بەکار براوە کە لە کۆنەوە خەسڵەتی کاری سیاسی بیرۆکە جیاجیا و زیندووەکانی مرۆڤایەتیە، ئەم بەکاربهێنانە نوێیە ڕادیکالیزمی سەرمایەداری تەوژم دەداتە دونیا بەرەو پاشەڕۆژێك کە پڕە لە مەترسی نەك پاشەڕۆژێکی ڕووناك، چونکە زۆرینەی دانیشتوانی گۆی زەوی بەردەوام دەکەونە ژێر هەڕەشەوە، هەڕەشەیەك کەکاری ڕاستەوخۆ دەکاتە سەر باری گوزەرانیان. بۆیە هیچ سەیر نیە کە گرۆی جیاجیا لە دونیادا لە سەر شێوازی زۆر توند بوەستنەوە و بەرەنگاری ڕەوتی گلۆبەلایزەیشن بکەن، ئەگەرچی ڕەوتە گلۆباڵیە کۆنەکان میکانیزمی هێواش و کاریگەری لەسەر بەهاکان هەبووە، کاریگەری لەسەر شێوازی حوکم و ژیان هەبووە، پاشان ڕەنگی داوەتەوە بۆ سیستەمی ئابووریەکان و کاریگەری لەسەر گوزەرانی خەڵك دروست کردوە هەرچەند زادە و دەرهاویشتەی قۆناغە ئابووریە جیاجیاکانی خەڵکیش بووبێت، لە کاتێکدا گلۆبەلایزەیشنی ناویراو، زۆر بەخێرایی و ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر گوزەرانی خەڵك دروست دەکات، چونکە پرۆسەیەکی هاوتەریبی سیاسیە بۆ کارئاسانی پرۆسەیەکی ئابووری

سەرمایەداری. ئەمەش بووەتە هۆی درووست بوونی گلۆبەلایزەیشنێکی نا سیستەماتیك دژ بە گلۆبەلایزەیشنی ڕادیکالیزمی سەرمایەداری کە بۆ نمونە کچە نوسەری فەرەنسی، فیفیان فۆر ستەر، پێناسەی گلۆبالیزم دەکات و پێی دەڵێت (تیرۆریزمی ئابووری). ئەوەش لە خودی خۆیدا سانایە بۆ من چونکە کاری خێرا و توند کاردانەوەی خێرا و توندی لێدەکەوێتەوە(٢).

(٢)

لە ڕاستیدا کاتێك بەختیار عەلی باس لە سەرسوڕمانەکانی دەکات بەرامبەر بە جەنگ، ئەوا شکستی ڕۆشنبیری داخراو لەوەدا دەردەکەوێت کە نەزانێت جەنگ کەی دەستی پێکردووە و لەوەش ترسناکتر ئەوەیە کە نەزانێت کەی کۆتایی دێت.. ئا ئەمە یە ڕۆشنبیر و نەوەی نوێی دونیا و کوردستانیش بەرەو هەڵدێرگە دەبات، کە تۆی ڕۆشنبیر ناتوانیت بەردەمی ڕوون بکەیتەوە سەبارەت بە جەنگێك کە ئەو بەشێکە لە و جەنگە و ناتوانیت بەردەمەکانی خۆی و دەسەلاتەکەی بکەیت بە چەند ڕێیان بۆ هەڵبژاردنی ئەلتەرناتیڤی پراکتیکی باشتر، نەتوانیت کاریگەریت لە سەر سیاسەتە ئابووریەکان و بازاڕ هەبێت، ئەوا چۆن دەتوانیت داواکار بیت لە هەڵنەبژاردنی سەنگەرەکانی جەنگ لە خەڵك. لەراستیدا دامەزراوە سەربازیەکانیش خوازیاری تاقیکردنەوەی خۆیانن لە بواری گلۆبالێدا هەرچۆن لە کۆنەوە بەشداری سیاسیانەیان کردوە بۆ بەشداری کردن لە دەسەلات و یەکلایی کردنەوەی بارودۆخەکان لە ڕێگای هێزەوە. ئەو دامەزراوە سەربازیانەش گەرچی کەوتوونەتە ژێر دەسەلاتە سیاسیەکانەوە بەلام لە هەمان کاتدا جۆرێك لە سەربەخۆی و کاریگەریان هەیە لەسەر دەسلاتی سیاسی و ناوەندی بڕیاردان.

بە پیت ترین بازاڕ بۆ کاڵاکانی ئەمڕۆی سەرمایەداری ئەو ناوچانەیە کە کلتوری ئیسلامی تیایدا ڕەگی داکوتاوە، لە کاتێکدا کە لایەنە ئیسلامیەکان بەیانی دابڕان لە بازاڕی ئەمریکی دەردەکەن، ئەوا ئەگەری جەنگ شتێك نیە شاراوە بێت و بەتەنها کلتوری ڕەخنەی هیومانیستیانە و خەونی پەمەیی بەر بەو جەنگە ناگرێت. شەڕەکە شەڕی بەرژەوەندی و باوەڕە، شەڕەکە شەڕی نێوان تەکنەلۆژیا و مەزهەبە، لەو نێوانەشدا کە کەرەستەی خاوی سوپای هیومانیستی دەبێتە تەرەفگیری یەکێك لەم دووانەیە، ئەوە تەنها بەهۆی نەبوونی بەرنامەڕێژی هیومانیستەکانە لەسەر گۆڕەپانی سیاسی.

پێناسەکردنی بەختیار عەلی  بۆ ئەو موتڵەقگەراییە، بەرەی سێهەمی موتڵەقگەراییە. نەبوونی لۆژیکێکی ئەو موتڵەقە کە کاری عەمەلی بۆ کرابێت، ئەگەر ئەو موتڵەقە بریتی بێت لە لابردنی موتڵەقەکانی تریش یان ڕاستە بڵێن موتڵەقی ڕەتکردنەوەی چەمکی موتڵەقگەرایی، بۆیە ئەو جۆرە پێناسەیە بۆ ئەم موتڵەقانە موتڵەقگەرایی پەرت بوون و بێستراتیژیەتی ڕۆشن فکرەکانە. ئامادەی نەبوونی تیوریستێکە کە ستراتیژی خۆی نیە لە چوارچێوەیەکی پراکتیکیدا.

موتڵقگەرایی بەختیار عەلی لەوەوە دەست پێدەکات کە دەیوێت کۆمەڵەکان وەك خۆی بکاتە کوڕی ئەم و ئەو، چونکە توانای بەرهەمهێنانی تیۆری نوێیان نیە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی لە بەردەم دۆزینەوە تەکنەلۆژیە نوێیەکان و لە پاش پێشهاتە سیاسیەکاندا، جانازانم ئەمە ناوبنێم سەلەفێتی سەردەمی مۆدێرنیزم یان پۆست مۆدێرنیزم. جارێکی تر ئەم گەڕانەوەیە کە بن لادن و بۆش لە کوڕەکانی مەحوی و مارکس و ئەبوعەللا معەڕی و فۆکۆ بێبەری دەکات.

نایەوێت دان بەوەدا بنێت کە ئەو کەسانە کلتورێکیان تەمەن درێژکرد بۆی هەیە نەوەی لەو جۆرەش بخاتەوە، ئەگرێ ئەوانیش کوڕی لەو جۆرەیان هەبێت، بەڵام بەداخەوە نەوە پاکەکانیان نەیان توانیوە کوڕی سەربەخۆ و ئازاد تاسەر بەرهەم بهێنن، تەنها دەتوانن لە بەرخۆیانەوە ورتەو پرتەیان بێت لە ساتێکدا نەفرەت لەوانیش دەکەن و ئێستایشیان پێ قبوڵ نیە و ناتوانن خۆشیان داهاتوویەك درووست بکەن کە بتوانێت نەوەی نوێی ئازاد و مرۆڤدۆست بەڕێوەبەرێت، میهرەبانی پیادەبکات و پێکەوژیانی ئاشتیانە بەرجەستەبکات.

لێرەدا یۆتۆبیا بەوە دەست پێدەکات کە ڕۆشنبیر هەست بکات ئەتوانێت تەنها لە ڕێگای ڕەخنەو نوسینەکانیەوە کۆمەڵگاکان ئازاد بکات لە هەموو بەها ناشرینەکان. ئەمەش بەڕاستی کۆسپە لە بەردەم ڕۆشنبیردا کە جگە لەوەی ناتوانێت بەرهەمی فکری هەبێت نا هێڵێت زانیاری تەواوی بە واقعی سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵەکەی و مرۆڤەکانی هەبێت. میکانیزمی کاری ڕۆشنبیرەکان، لە بواری کاریگەرانەی ڕۆڵی ڕۆشنبیر تێپەڕیوە، چونکە هەمیشە ڕۆشنبیرەکان وەك ڕێنیشاندەر و خەباتکار و کەسی شۆڕشگێڕ کاریانکردووە، مەبەستم خەباتی چەکداری نیە گەرچی لە هەڕەتی ئەوسەردەمانەی خەباتدا کەمتەرخەمیان نەکردووە، ئامانجیشیان گۆڕینی واقع و واقعی کۆمەڵەکانیان بووە بەرەو ئازادی. ڕاستە ئەو ڕۆڵەی ڕۆشنبیر لە کۆندا بینیویەتی هەندێ جار لەسەر حسابی تێگەیشتن و بەرهەم نەهێنانی زانیاری بووە، بەڵام پێچەوانەکردنەوەی هاوکێشەکەش بێگومان لە بەرژەوەندی خاوەن بەرژەوەندیەکانی دەسەڵات و پشت دەسەڵاتە.

ڕاستیەکە بریتیە لەوەی لە ڕابردوودا ڕۆشنبیر تا ڕادەیەکی زۆر بێئاگا بووە لە دیاردەو ڕووداوەکانی دونیا و نەیتوانیوە بەرهەمەکانی لەسەر ئاستی پێویستی ڕابردوو بێت و ئیمپاکتەکانیشی بۆ ئەمڕۆ درێژەی هەیە. بەڵام گۆڕانە پێشهاتەکانی ئەمڕۆی دونیا بەجۆرێکە ڕۆشنبیر توشی ڕاچڵەکاندن دەکات و تەزووەکانی ئەوەندە بەهێزن کاتێك لە قۆزاخەکانیاندا دەپێچرێنەوە زۆر یۆتۆبیانە سەیری ئازادی و ڕاپەڕین و پێشکەوتن بکەن، بەجۆرێك دوای گۆڕانەکان دەکەون و ناتوانن کاریگەری لەسەر مێژوو دروست بکەن. ئەم ئەنجامانەش سەیر نین، کاتێك هزرمەند نەتوانێت تیۆری و فکری کاریگەری بەرهەمهێنابێت، ئەوا ناتوانێت بەشداری گۆڕان بکات هەمیشەش لە پرۆژەکانیدا سەرکەوتوو نابێت، چونکە دوورە لە خوێندنەوەی واقع و بەرهەمهێنانی بیرۆکەیەك کە پراکتیزەبکرێت.

من لەمیانەی ئەم پەرەگرافەدا بە بەختیار دەڵێم: ئەی کوا ئەو هێزەی دەیەوێت لە تاریکی بمانپارێزێت و لە دواکەوتووی بەرەوپێشکەوتووی بمانبات، یان تەنها دەتەوێت بەزۆر بەسەر خۆتیا ساخبکەیتەوە کە ببیتە ئەنتی ڤایرۆسێکی بەکاربراوی هۆشمەندی خەڵك، بەکۆمەڵێك وشەی جوان عاتیفەکان بهەژێنیت، ئەمە لەو دیاردەیە دەچێت کە لە پرسەکانی لای خۆماندا دەمان لاوێننەوە و زیاتر گریانەکانمان پێدەردەبڕن. لە ڕاستیدا ئەوەی لە یۆتۆبیاکانی خۆیدا قۆزاخەی خواردبێت بە دڵنیایەوە واقع گەمارۆی دەدات.

کاتێك بەختیار عەلی باس لە بەدحاڵی بوونی نێوان کلتورەکان دەکات، من بەدۆعای لە یەکتر نەگەیشتنی نێوان کلتورەکانی تا ڕادەیەك دەڵێم ئامین بە لام بە خەونی ڕۆشنبیرانەی لە یەکتر گەیشتنت دەڵێم یۆتۆبیایەکی قۆزاخە

خواردوو. بەدحاڵی بوون لە سەر ئاستی جیاجیا پەراوە دەكرێت، ڕێگرتن بە پەراوەكردنیش ڕێگرتنە لە ئازادی و تەنانەت سیستەمە تەكنەلۆژیەكانی ئەمڕۆ و بازاڕیش پێیان لە ئەستۆ ناگیرێت. ئەوانەی دەیانەوێت ئەزموونی خۆیان بسەپێنن، بەكردەی جیاجیا گوزارشی لێ دەكەن و هەموویان كردارەكانیان بە مرۆڤدۆستانە پاساو دەدەنەوە، گرفت لە وەدایە كەبزاڤی لەیەك گەیشتنی مرۆڤدۆستانە چالاك نیە و بە پێچەوانەوە ڕێگا خۆشكەرە بۆ پاساوی هەڵخەڵەتێنەر، بۆ بەگەڕخستنی توانا ژێرمامناوەندیەكان بۆ بۆسەكانی شەڕ. پێم ناڵێی كام پەیامە گلۆبەلایزەیەی ڕۆشنبیر و هیومانیستەكان لە ژێر هەڕەشەدایە؟ ڕۆشنبیر و مرۆڤدۆستەكان، شوێن پرۆسە جۆراوجۆرەكانی گلۆبەلایزەیشنی ئیسلامی و نیولیبراڵی كەوتن نەك بەرهەمی داهێنان و ماندوو بوونی ئەوان بێت، مرۆڤدۆستەكان ئەمجارەیان زۆر بە پێچەوانەوە كاریانكرد، مرۆڤدۆستەكان خوازیار بوون هەلێك بقۆزنەوە كە پارووی گەورەی ڕادیكالیزمی سەرمایەداری بوو لە قۆناغی پۆست ئیمپریالیدا و هەرگیز بەكتێبخانە لە بیركراوەكانی ئەو سەردەمەی فكری مرۆڤایەت قووت نەدەچوو، گلۆبەلایزەیشن سادەترین مانای نزیك كردنەوەی دوونیا نیە لە یەكتری بەڵكو ئەوە یۆتۆبیای دەستە هەڵبژاردە قۆزاخە خواردووەكانە. هیچ كام لەو ڕەوتە فكریانە مونەسەسەیەكی سەربەخۆی لەناو پرۆسەی گلۆبەلایزەیشندا نیە كە بتوانێت دەسەڵاتی زانیاری، مەعریفی، یان سیاسی ئاراستەبكات، یاخود بیگرێتە دەست، گلۆبەلایزەیشن، كە سیستەمێكی كۆنی فكرە گشتگرشێوەكانی كۆنی مرۆڤایەتیە، ئەمڕۆ بە تیۆریەكی تر و بە ڕووخسارێكی تەرویجكراوەوە بەكاردێت.. گلۆبەلایزەیشن دیاردەی بیرۆكە جیاجیاكان بوو كرا بە پرۆسە لە پێناو فراوانكردنی بازاڕدا، بەڵام یۆتۆبیایەكان دەیان ویست و دەیانەوێت كاڵا

جوانەکانی دەستەبژێریکەن و ئەرکیشی پێوە نەکێشن، پارەیان پێنەدەدا یان ڕاستره بڵێین سەرمایەیەکی لاوازیان هەبوو ئەو پرۆسەسیەی پێ دەستەمۆ نەدەکرا (مەبەست هەموو سەرمایەکانە). ئەوەش گورز نیە لە گلۆبەلایزەیشن ئەوەندەی بەکارهێنانی کرداریە بە دوو شێوازی جودا، ئەگەرچی هەردوو شێر و خەتەکەش هەریەك بەجۆرێك بەکاری دەهێنن و سەرئەنجام سلبیە بۆ کۆمەڵەکان.

(٣)

لەمیانەی چەند پەرەگرافی ڕابردووەوە دێینە سەر باسی ئازادی، باشترین نمونە بۆ ئەم بابەتە ئەو ئازادیەیە کە بەختیار پێی وایە ئازادی لە کوردستاندا

• بێڕوخسارە، ئازادی شتێکە کە ڕوخسارەکەی وابەستەی ڕوخساری ئازادانەی خەڵکە و پێش هەموویان ڕۆشنبیرەکان، ئەوە لە ئەستۆی کردارەکانی ڕۆشنبیرە هاوشێوەکانی تۆدا نەیتوانیوە پرۆسەی ئازادکردنی خەڵك تەواو بکات، چونکە ئازادی ئەرکێکە دەکەوێتە سەرشانی هەموو کۆمەڵ بە هەموو چین و توێژەکانیەوە، بەبێ جیاوازی شوێنکار و پلە و پایەیان و لەسەرو هەموویانەوە ڕۆشنبیر، بۆیە پێویستە ڕۆشنبیرەکان کەمێك لە نەخۆشیە دەروونیەکانیان دەرباز بن و خۆیان بە دەستە هەڵبژاردەی کۆمەڵ و گەل نەزانن، ئەوانیش یەکێکن وەك ئەوانیتر ئەوانیش پیشەکەیان بریتیە لە بە ئەنجام گەیاندنی ئازادی چ لە ڕووی تیۆری و چ لە ڕووی پراکتیکەوە. جەماوەر و پێشمەرگە و حیزبە جۆر بەجۆرەکان توانیان لە ڕقێکی ئەستوورەوە، ستەمی سیستەمی بەعس و دەسەڵاتی دیکتاتۆریانەی سەدام لە سەر خەڵك لابەرن بە ڕێژەیەکی زۆر لە ناوچەیکی جوگرافی بەرفراونی کوردستاندا، کە چەندین ساڵ بوو ژینگەی پەروەردەیی ئەوان بوو سەرەڕای ئەوەی زەمینەی سیاسی لەدا

بوونی هەندێکیشیان بوو (لەو بارودۆخە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەربازیەدا گەشەیانکردووە کە دەسەڵاتی عێراقی و حیزبی بەعس بەرهەمی هێناوە لە عێراقدا بەگشتی و لە کوردستاندا بەتایبەتی)، بەڵام هۆشمەندەکان کامە پرۆژەی عەمەلیان هەبوو بۆ ئازاد کردنی عەقڵی خەڵك بە هەموو توێژەکانەوە تەنانەت بە سیاسەتمەدارە گەورەکانیشەوە. ئەوانە ئەرکی خۆیان بەجێهێنا بەڵام بەرەی ڕۆشنبیرەکان هەڵاتن لە بەرامبەر ئەرکەکانی خۆیان. ئەمەش زۆر هۆکاری هەیە و بەتەنها هۆکارەکان دەرەکی نین و لە دەسەڵاتی ئەواندا نەبێت، بەڵکو زەخیرەکەیان ئەوەندە بوو کە بەشی هەڵاتن بکات، دیارە مەبەستیشم لە هەڵاتن بۆ دەرەوەی وڵات نیە! چونکە ئەوەندەی سیاسەتمەدارەکان و هونەرمەندان کەناڵەکانی دەرەوەیان بەکارهێناوە بۆ گەشەکردنی سیاسی مەسەلەکانی کوردستان لەسەر ئاستی دەرەوە، ئەوەندە ڕۆشنبیرەکان خەمسارد بوون لە بەرامبەر هیومانیزەکردنی کۆمەڵی کوردستان لە سەر ئاستی جیهانی.

ئەرکی ڕۆشنبیر لە بواری بەدەست هێنان و بەرجەستە کردنی ئازادیدا تەنها بوون بە نوێنەری ئازادی نیە، بەڵکو پێویستە کە ژیربێژیەکی کارا بۆ بە واقعی و عەمەلی کردنی بیرکردنەوەو دەربڕین و بەرەنگار بوونەوەی ئازادانە بهێنێتە بەرهەم، وێڵ بوون لە تێگەیشتنی واقعی سیاسی و کۆمەڵایەتی خەڵك بۆ خۆی دوورکەوتنەوەیە لە پانتاییە کاریگەرەکاندا.

پێویستە لە یادمان نەچێت کە ئەو کلتورانە سەرجەم پڕن لە سوودی گەشە پێدەر بەیەکدی و زیانی کوشندە بۆ یەکدی، ئەوەش دەسەڵات و هێزی دژ بە دەسەڵات دەتوانێت زەقیان بکاتەوە لە هەموو سەردەمێکدا. بەڵام ئائامادەدەیی

تیۆری و مەعریفی کە بەتەنها لە ڕەخنەدا خۆی نەبینێتەوە کاری سلبی ئەو ڕووداوانە چالاك دەکات و بەرامبەریان ناوەستێتەوە. ئالێرەوە دەڵێم ئەگەر دەسەڵات و هێزێکی مەعریفی هیومانیستی ئامادەە باش و کارا هەبێت زۆر بە دووری نازانم سەرجەم دەسەڵات و هێزە سەرمایەدار و ئیسلامیەکانیش بەو هێزەی هەیانە بەرامبەری دەوەستنەوە ئەگەر هەڵقوڵاوی فەلسەفە و فکری خۆشیان بێت. بۆیە منیش دەڵێم (کۆکردنەوەی مۆزارت و شەجریان یان هێنانە دایەلۆگی مەحوی و مارکس خەیاڵێکی ڕۆمانسی نیە، بەڵکو خەونێکی یۆتۆبیە)، چونکە کوڕەکانی ئەوانە بە تەپڵی قارەمانانەی بۆش و بن لادن سەمادەکەن، ناحەقیشیان نیە چونکە ڕێگای ئاکتیڤتر و چالاکتر لە بەردەمیاندا ئاوەڵا نیە.

ئەم دیاردانەو زۆری تریش بۆ غیابی ڕۆشنبیرەکان دەگەڕێتەوە لە مەیدانە کرداریەکانی بەرگرتن بە جەورو ستەمەکانی ئەو مونەسەسانە، غیابی ئامادەباشی گوتارە پێش وەختە کانی ڕۆشنبیرەکانە لە بەرامبەر ڕووداوەکاندا، بۆیە بەدووری نازانم ئەم دیاردەیە بەردەوام بێت گەر ڕۆشنبیر بەشداری عەمەلی گۆڕان نەکات. چونکە ئەوڕێبازەی بەختیار دوای ڕووداو دەکەوێت و لە پشتەوە تف لەو شەیتانانە دەکات کە نای بینن، یان ئەگەر بینراش لە تەرازووی هێز و گۆڕاندا قورسای سفر بوو، ئەوا ستەمە میلی هیچ تەرازوویەك بیخوێنێتەوە. بەلامەوە سەیرە، مەترسیت لە وە نەبووبێت کە ئەگەری ڕووداوێکی لە و جۆرە هەبێت و ڕووبدات، لەوەش سەیر تر ئەوەیە کە تەصەوری ئەو پێشهاتانەت نەکردبێت، ئەم ختابەی تۆ پڕە لە سەرسووڕمان و موچووڕکە، پڕە لە بێئاگایی لەهەموو شتەکان، لە هەمووشیان سەیرتر ئەوەیە کاتێك ڕەخنە لە ئەکادیمیستێکی هەر لایەکیان دەگریت و بەم دەڵێیت پۆلیسی ئەمریکی و بەمیتریان بن لادن، بەدیوێکدا بە واعزی ئەو فکروکلتورو ئەدەبیاتەی

دەزانیت، بەودیوی دووەمدا خۆت بە واعز و ڕێنیشاندەر دەزانیت، کاتێك ڕابەر بوویت بۆ ئەو بەرنامەیەت نەبوو بۆی؟ چۆن جورئەتت کرد ڕەخنەبگریت؟ یان کاتێك هێزێکی دەرەکی هەڵی خەڵەتان تۆلە کوێ بوویت؟ خۆ ئەگەر ئەویش لە و ئاستەدایە ڕابەری تۆ بێت ئەوا قرِوقەپ حیکمەتە و شوێن کەوتنیش شەهامەت، تۆش بۆخۆت ئازادی کام حکمەتەیان تەکفیر ئەکەیت.

(٤)

کۆمەڵێك پرسیاریتر دێتە پێش هیوادارم بتوانین وەڵامیان بدەینەوە. ئایا گلۆبەلایزەیشن بزووتنەوەیەکی بابەتیە و ناتوانین لێی دەربازبین؟ کام گلۆبەلایزەیشن، گلۆبەلایزەیشنی مەسیحیە ڕادیکاڵەکان، نیولیبرالیزم، سەرمایەداری نێودەوڵەتی یان گلۆبالێزمی ئیسلامەکان یان هەرگلۆبالێزمێکی تر؟ ئایا گلۆبەلایزەیشن ڕەها بوونی دەسەلات و شێوازی ژیانی ئەمریکیە بۆ قۆرخی سەرچاوە ئابووریەکان و سەپاندنی ڕۆشنبیری ئەمریکایی یان ڕەهابوونی ئاینەکان و سیستەمی حوکمی ئیسلامیەکانە؟ لە بەرامبەر ئەم پرسیار و پەستانانەدا تا چەند کۆمەڵە لاوازەکان دەتوانن خۆیان ڕاگرن و چارەسەری کاریگەریەکانی گلۆبەلایزەیشن بکەن لەسەر خۆیان؟ ئەی ووزە و زەخیرەی خەلك و دەسەلاتی کوردستان چیە بۆ ئەم بەرنگاربوونەوەیە؟

بەختیار عەلی باس لە هەرەس هێنانی دیموکراسیەت دەکات و لە لای ئەو قیامەت خەریکە هەڵسێت، بەلام دیموکراسیەت لەو ساتەوە شکستی خواردووە کە یان دیکتاتۆریەتی سیستەمە یان دیکتاتۆریەتی سەرمایەیە، گلۆبەلایزەیشن یەکەم کەرەستەی ئەو پەراوە دیکتاتۆریانەیەیە کە بە ڕێگای نیولیبرالیزم یان ئیسلامی سیاسی پەراوە دەکرێت .. ئەمە خۆی لە خۆیدا تێهەلکێشی تیوری

جیاوازەکانی گلۆبەلایزەیشن ڕوون دەکاتەوە کە جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ یەکێتی دژەکان. بەرەی ئیسلام بەهێزی بیروڕا مامەڵەی لە گەڵدەکات بە بەکارهێنانی سادەی تەکنەلۆژیا و فرتوفێڵە لە بارەکان، بە سوود وەرگرتن لە کەم و کوڕیەکانی سیستەمی بازاڕ. بەرەی شێوازی ژیانی ئەمریکیش بە ڕێگای شەرعیەتی نێو نەتەوەیی و هێزی سەرمایەو تەکنەلۆژیای سەربازی مامەڵەی لە گەڵ دەکات. لە کوردستاندا دەسەڵات جدیانەتر سەیری مەسەلە دیموکراتیەکان دەکات، چونکە هیچ ئەزموونێکی لەو جۆرەی نیە و هیچ بنەمایەکی فکری و فەلسەفی لەو جۆرەش سەقامگیر نەبووە لە کوردستاندا بۆ ماوەی پتر لە پەنجا ساڵ، بەڵام پەراوەنەکردن و تێنەگەیشتن لە دیموکراسیەت لە لایەك و مێژووی پەروەردەیی چەند دەهەی ڕابردوو خەمی سەرەکی ئێمەن، چونکە دیموکراسیەت لە کوردستاندا و لە لای دەسەڵاتی کوردی کەرەستەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجێك نەك خودی ئامانجەکە بێت، ئەگەر چی لە لای هەندێك بووەتە ئامانجیش چ جا ئەوانە لە ناو دەسەڵاتدا بن یان لە دەرەوەی دەسەڵات. من پێم وایە یەکێتی و پارتی و حزبەکانی تریش تەبان لە سەر ئامانجەکان کە ئەویش پچڕینی لایەنی کەمی مافەکانە بۆ گەلی کوردستان، بەڵام لە شێوازی مامەڵەو بەرژەوەندیەکانیاندا تەبانین سەرەڕای کەمی سەرچاوە بۆ دەستەبەرکردنی ئەو مافانە، مەبەست لە سەرچاوە، سەرچاوەی ئابووری، سیاسی، مەعریفی، هەل و مەرجی ناوچەیی و نێودەوڵەتیە. بۆیە گەر سبەی هێزێکی ئیسلامی باڵا دەست یان کۆمۆنیستی باڵا دەست یان پۆست ئیمپریالی باڵادەست یان هەر هێزێکی تر بتوانێت کوردستان جێگا بکاتەوە لە ستراتیژەکانی خۆیدا، ئەوا هەموو دروشم و سیاسەتەکانی کوردستان دەگۆڕێت بەو ئاقارەدا. ئەمەش بەپلەی یەك دەگەڕێتەوە بۆ هەژاری ئەم وڵاتە و بۆ

تواناكانی بەردەستی خەڵكی كوردستان، هەروەها بۆ كەمتەرخەمی دەستە هەڵبژاردەكان لە درووستكردنی بزووتنەوەیەكی رۆشنبیری كە ئەركەكانی گۆرینی ئەو هەژاریە بێت بۆ ئاستێكی باشتر. قۆزتنەوەی هەلی جیهانی لە سیاسەت و فكردا جودایە و مانای وانیە كە حزبە سیاسیەكان نەتوانن چارەسەری كێشە ناوخۆییەكان بكەن ئەوەندەی قۆزتنەوەی هەلی جیهانیە لە نێو سیاسەتە ئیقلیمی و ناوخۆییەكاندا. زۆر پراكتیكیانە پێت بڵێم لە دونیای سیاسەتەوە كاتێك دوو هێز بچوك بن یان گەورە، كە دەگەنە بن بەست لە كێشەكانی خۆیان ناچار دەبن پەنا بۆ هێز بەرن. كاتێك هێز و جەنگ پێی یەكلایی نەكرایەوە ناچار دەبن پەنا بۆ دانوستان بەرن، بەدڵنیایەوە دانوستانی پێش جەنگێكی كوشندە كاتێك بریاری جەنگ درا بێت هەر زۆر خەیاڵیە، پاش جەنگ دانوستان پێویستیەكی سەرەكی بە دوژمنێكی هاویەش هەیە بۆ لایەنە ناتەباكان تا بتوانن یەكبگرنەوە لە تەوەرەیكدا بۆ ئەوەش ئەزموونی جەنگ و دانوستاندنەكان بخوێنەوە.

بەڵام ئەی كوا ئەو سیستەمەی كە دۆزراوەتەوە بۆ پاكسازیكردنی پاكی و ناپاكیەكانی سەرجەم كلتورەكان، كوا ئەو فلتەرایزەیشنەی كە توانی مرۆڤایەتی لە خەوشی كلتورەكان پاك بكاتەوە، ئەگەر ئەمەش نەكرا، ئەوا خاوەن كلتورەكان پابەندی خۆیان بۆ چاك و خراپی كلتورەكانیان دەست پێوە دەگرن و دەكەونە جەنگەكانەوە هەروەك پێشان. پێوەر چیە بۆ ناسینەوەی پاكی و ناپاكی ناو كلتورەكان؟.. ئەمە تەنها نەبوونی لۆژیكە كە ئەم گوتارە بە بەختیار عەلی بەرهەم دەهێنێت و دەیەوێت بە بوونی شەرعیەتی ئازادی و زەروورەتی ئیختلاف پاساوی بداتەوە.

بەختیار عەلی کاتێك دەکەوێتە نیوان بەرداشی عەقڵ و عاتیفەوە خۆشی نازانێ کام ڕایەڵەی بەدەستەوەیەو کامەی تری لێ ئاڵۆزکاوە، تەواو نامۆبوون بەدیی دەکەم چونکە عاتیفەی ڕۆژهەڵاتی بەختیار و عەقڵی خۆرئاوایی وەنەوشەیی بەرەو پەرت بوون و نا سەقامگیری فکری بردووە. ئازادی ودەرباز بوون لە دیکتاتۆریەت هەرگیز ناکرێت ببەسترێتەوە بە هەنگاوە ئەمریکاییەکان و توندڕەوی ئیسلامیەکانەوە، بەڵکو ئەوە خواستی مرۆڤەکانە. ئەمە چ حکمەتێکە گەر ئەمریکا گەڕەکێکی وێرانکرد ئیتر من دەستەو ئەژنۆ دانیشم لە بەرامبەر کاولکردنی ئەو شارانەی منی تیادا دەژیم؟ یان هەر ڕۆژهەڵاتیەکی تر! کە من بڕوام وایە بۆ هەر مرۆڤێکی تریش ڕاستە و باشترین نمونەش شۆڕشەکانی ڕابردووە کە بەبێ هیچ پاڵپشتێکی جیهانی سەری هەڵداوە لە کوردستاندا. من لێرەدا و لەم پەرەگرافەدا نایەمە سەر تاکتیکی سیاسی کە بۆ خۆی شتێکی زیندووی ترە بۆ کوردەکان لە دونیای یاریە سیاسیەکاندا، بەڵکو دێمە سەر تاوانە فکریەکانی بەرەی ئیسلامە توند ڕەوەکانی نمونەی تالیبان و ئەمریکا کە هەردووکیان لە یەك تەرازوودا دەبینمەوە یەکەمیان مامەڵە لە گەڵ ئازادیە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانمان دەکات و دووەمیان یاری بە بازاڕ و بونیادە مەعریفی و شارستانی و دەرفەتە دیبلۆماسیەکانمان دەکات. ڕاستە ئەگەر یەکێك نەیتوانیبێت خودی خۆی لە یاریە سیاسیەکاندا بەشداری بکات هەموو پرۆسەیەکی سیاسی دەیترسێنن.

بەختیار عەلی باس لە گواستنەوەی جەنگ دەکات بۆ ناو کوردستان، جەنگ نەگوازراوەتەوە بۆ ناو کۆمەڵگای کوردی بە خواست و ویستی سەرکردە یان میللەتی کورد، ئەمە سەرلێشێواویە، بەڵکو زیاتر دەتوانم بڵێم لە بێخەبەران

کەشکەك سلاوە. جەنگ لە کوردستاندا لە کۆنەوە مەشقی زۆری بۆ کراوە، جەنگ لە کوردستاندا بخوازیت یان نا ئەوە جەنگە و بۆتی هەنارده دەکەن.

بە نمونە، ناوچەی هەورامان کە هەر لەمێژەوە یەکێکە لە سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی ئەدەب و وێژەی کوردی، ئەم ناوچەیە ڕاستە ناوچەیەکی سەختی شاخاویە و شۆڕشەکانی کورد بەکاریانهێناوە بۆ جۆش دانی خەباتی ڕەوای گەلی کوردستان و دوژمنیش تێکشکانی جۆراوجۆری لەم ناوچەیەدا بەخۆوە بینیوە. ئەمەش ئەوەناگەیەنێت کە دەکرێت ببێتە پشت وپەنایەکی جوگرافی بۆ ڕێکخراوێکی چەکداری دژ بە بەها ئازادەکانی گەلێك، چونکە بزووتنەوەی چەکداری بەتەنها پێویستی بە هەل ومەرجی جیۆپۆلیتیکی نیە بۆ سەرکەوتن و بەرەوپێش چوون و پێکانی ئامانج.

ئەزموونی دیموکراسی لە کوردستاندا زۆر ساوایە و هەموو سیفاتە بۆ ماوەییە کۆمەڵایەتیەکانی ئەم کۆمەڵگایەش تاڕادەیەکی زۆر دوورن لە سیفاتی بۆماوەیی کۆمەڵگایەکی دیموکراسیەوە. بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان ناتوانن خۆیان قاڵبکەنەوە لە بارودۆخ و زەمینەیەکدا کە لە بەرژەوەندی پرۆژەیەکی دیموکراسی تەندروستدا بێت. لە ڕوانگەی خواستەوە خواستی ئازادی زۆر بەهێزە لەناو ئەم کۆمەڵگایەدا و ئەوەش ژینگەیەکی باشە بۆ پەرەسەندن و گەشە کردنی ئەزمونێکی دیموکراسی کە ناکرێت هەرگیز لە بەرامبەر ئەو ئەزموونی دارستانەدا بەراورد بکرێت کە بەختیار عەلی باسی لێدەکات. گەر، یەکێك بەوردی بڕوانێتە مێژوو و بنەماکانی درووست بوون و سەرهەڵدانی ئەو گروپە ئیسلامیە توندڕەوانە، ئەوا بە ئاشکرا دەبینێت کە ئەمە پرۆسەیەکی داگیرکاریە و هیچ پەیوەندیەکی بە بزووتنەوەیەکی سیاسیەوەنیە

کە زادە و هەڵقوڵاوی ناو جەماوەر و گەلانی کوردستانەوە هەبێت. لەناو کوردستاندا زۆر دەمێکە دوژمنان کاریان کردووە بۆ هەڵخەڵەتاندن و فریو دانی گەنجەکانی ئەم گەلە و پێکهێنانی گرۆی ئەنتی نیشتمانی کە بەشێوەیەکی گشتی دژی بەرژەوەندیەکانی گرۆ ئێتنیکیە جیاجیا کانی کوردستان بوون. بنەماکانی ئەم بزووتنەوەیە سوودیان لەم فاکتەرانەی خوارەوە وەرگرتووە بۆ هاتنە ناو کوردستان و قووتکردنەوەی وێستگەیەکی بێزارکەر بۆ نمونەی حکومەتە دیموکراسیەکەی هەرێمی کوردستانی عێراق لە ناوچەکەدا و ئەو ئازادیە نمونەییەی کە گەلی کورد خوازیارە بەرجەستەی بکات لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا.

١. سوود وەرگرتن لەو تاوانبارانەی لەدەست یاسا هەڵاتوون.
٢. سوود وەرگرتن لە شەڕی ناوخۆ و هێواشی پرۆسەی ئاشتی.
٣. سوود وەرگرتن لە ژمارەیەك لە منداڵ و گەنجی فریوخواردوو.
٤. سودوەرگرتن لە پێشینەی کوردستان کە گەلێکی موسڵمان تیایدا دەژی.
٥. سودوەرگرتن لە کراوەیی سنوورەکانی کوردستان و ئازادی کاری سیاسی لە کوردستاندا.
٦. دراوسێیەتی کۆماری ئیسلامی ئێران کە بە پاڵپشتێکی ستراتیژی خۆیانی دەزانن بەبێ گوێدانە واقعی نا شارستانیانەی جموجوڵە سەربازیەکانیان.

هەندێ لەم هۆکارانە بنەڕەتین و زووربەیان لاوەکین، هیچ جێی دوودڵی نیە کە کاتێك تیرۆر گەشەداکات لە کۆمەڵێکدا، ئەوە ئەنجامی ئەوەیە کەناتوانێت بەرێگای سیاسی مامەڵە لەگەڵ ململانێی ناو واقعی سیاسی ئەو کۆمەڵەبکات. بۆ نمونە کاتێك تیرۆری دەوڵەتی لە دژی گەلی کورد ئەنجامدرا بە چەکی کیمیای و ئەنفال و پرۆسە جیاجیاکانی جینۆساید، ئەوە سەرئەنجامی دۆشدامان و

نوشستی دوژمن بوو بەرامبەر ئیرادەی سووری گەلی کوردستان لەسەر مافە جۆراوجۆرەکانی. مل کەچ نەکردن و خۆبەدەستەوەنەدان لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی حکومەتی عێراقی سەرئەنجامەکەی پیادەکردنی سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزی و ڕاگواستنە لەلایەن حکومەتی ناوبراوەوە. ماوەی دەساڵی ڕابردووی ژیانی ئازاد لەم هەرێمەی کوردستاندا زۆر پیلان و نەخشەمان بینی لە لایەن دوژمنانەوە بۆ لە باربردنی ئەزموونی گەلەکەمان و خۆشبەختانە سەرکەوتوو نەبوون ئەگەرچی کاریان کردوەتە سەر بەرەوپێش چوونی ئەزموونەکەمان.

پیادەکردنی کاری تیرۆریستانەش لە ئەمڕۆی کوردستاندا یەکێکە لەو دۆڕاوترین هەوڵانەی پیادە دەکرێن لە ژێر هەرناونیشانێکدا بێت، جا ئەو هەوڵە بۆ دژایەتی گەلەکەمان بێت بە تەقەلای دوژمنان یان یەکێك بێت لە هەوڵەکانی تۆڕی تیرۆریستی جیهانی بەناوی ئاینی ئیسلامەوە یان ڕادیکالیزمی سەرمایەداری. گەر بەنمونە ئەزموونەکانی تیرۆری دەوڵەتی و نادەوڵەتی سەیرکەین لە سەردەمی فیرعەونەکاندا، قورەیشیەکانی سەرەتای ئیسلام، هۆلاکۆ و جەنگیزخان، ئەڵمانەکان بەرامبەر بە جوولەکە، یەکێتی سۆڤێتی جاران، ڕومانیا و سەردەمی چاوشیسکۆ و تەنانەت سیستەمی عیراقی بەرامبەر بە کورد، هیچ کام لەمانە سەرکەوتنیان تا کۆتای بەخۆوە نەبینیوە. لەلایەکی ترەوە پێویستە ماك و هەوێنی تیرۆریستیانە لە ناو گەلێکدا هەبێت بۆ گەشەسەندنی لەو جۆرە گرۆیانە. گەرچی ڕاستە چەم بێ چەقەڵ نیە، بەڵام گەلی کورد بە ئەزموونێکدا ڕۆشتووە و کلتورێکی هەیە بە ئاسانی نابێتە گەلێکی تیرۆریست، بۆئەم مەبەستە زۆر گرنگە پێناسەی تیرۆر بەجۆرێك بکرێت خەباتی ڕەوای بیرۆکە و ئەتنیکە جیاجیاکان نەخاتە دووتوێی ئەو پێناسەیەوە، کاتێك ئاستی ئازادی و

و گفتوگۆی سیاسی و ئازادی سیاسی نزیك بوو لە سفرەوە، هەروەها ئاستێکی خوێندەواری و ڕێژەیەك لە ڕۆشنبیری گشتی بەرجەستە دەکرێت کە بە پێکهاتە ناتوانێت ببێتە گەلێکی دژە مرۆیی. بەتایبەت ناوچەی هەرێمی کوردستان، بەردەوام گەلانی ئەم ناوچەیە خوازیاری نوێخوازی و بەرهەمی تەکنەلۆژی تازەن، هەرگیز لە گەڵ جمووجوولێکی سیاسی پاشکەوتوودا یەکناگرنەوە. گەر زیاتر لە سەر دەڤەری سلێمانیش بدوێین بە تەواوی خەڵکی ئەم ناوچەیە بە ڕۆشنبیر و کەم ڕۆشنبیریشەوە زۆر ستەمە بتوانن لە چوارچێوەی سیستەمی سیاسی لە قالّبدراودا هەڵبکەن و نەك ژیانی سیاسی بگرە ژیانی ئاسایشیان بۆ ناچێتە سەر و بەوەندەوە ناوەستێت بەڵکو دێنە وەلام و کردار لە بەرامبەر ئەو جۆرە سیستەمانەدا. تەنها سیەستەم کە بتوانێت درێژەی هەبێت و دەوام بکات دەبێت دەرفەتی هەمەڕەنگی و جێی ڕەخنەگرتنی تیادا ببێتەوە.

بۆیە بەردەوام بوونی ئەو گرۆ تیرۆریستیانە کە زیانی گشتی خەڵکی لە خۆگرتووە و ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ئازادیە کانی تاك هەیە ناتوانێت بەردەوام بێت. گەریگەڕێینەوە سەر باسکردنی هەناردنی جەنگ لە دەرەوە، دەبینین سەران و بزوێنەرانی ئەم گرۆیانە دانیشتوان و بنەڕەتیان ناگەڕێتەوە بۆ ناوچەی هەورامان بەڵکو لە ناوچەکانی تری کوردستان و تەنانەت عێراق و جیهانیشەوە هاتوون. ئەوەی جێی هەڵوێستەیە ئەم گرۆیە لە لایەن سەرچاوەیەکی دارایی دژە مرۆڤەوە پشتگیری دەکرێن کە لە ڕووی ئابووریەوە بەهێزن، بۆیە بۆ بەردەوامی خۆیان هیچ دوورنیە لە دەرەوەی کوردستانەوە تەمویل بکرێن بە هێزی بەشەریش نەك تەنها لە ڕووی مادیی و هێزی سەربازییەوە، ئەمەش سیمایەکی داگیرکاریە کە دژ بە گەلەکەمان دەکرێت و پێویستە سیاسەتمەداران و خەڵکی کوردستان لەو دیاردەیە بەئاگابن و کار...

عەمەلی بۆبکەن، کاتێکیش باس لە هەڵوێستی ڕۆشنبیر دەکەین دەبێت ڕۆشنبیر تیژی عەمەلی پێبێت بۆ چارەسەر کردن و تاقیکردنەوەی ئەو تیژانە.

کاتێك دوژمنەکانی کورد بیریان لەم جۆرە داگیرکاریەکردبێتەوە بێگومان سود لەو تۆڕە جیهانیە وەردەگرن کە پاڵپشتی ماددی و مەعنەوی تیرۆردەکات تەنانەت لە وڵاتانی خۆرئاواشدا، دەنا ئەم پرۆسەیە سەرچاوەیەکی دارایی زەبەلاحی دەوێت و پاشان ناگاتە ئەنجامیش. ئەم ڕاستیانە ناچارم دەکات بڵێم تۆ بە هیچ کلۆجێك لە کایە سیاسیە واقعیەکان ناتوانیت بدوێیت یان پەی پێبەریت، خەڵکی ئەم وڵاتە پێویستی بە لاوانەوە نیە هەر چۆن پێویستی بە درووستکردنی بۆش و بن لادن نیە. بەڵام کاتێك کێشەکانی گلۆبالیزم نا چێتە هاوکێشە ناوخۆییەکانەوە کە ناوخۆییەکان زادە و دەرهاویشتەی گلۆباڵیان بۆ دەرەوەی خۆیان پێبێت. پێم ناڵێیت کامە سیستەمی سیاسی، ئابووری، ڕۆشنبیری تەنانەت سیستەمی پاشاگەردانیش نیە لە ناوخۆی تۆدا ئەوەندە بەهێز بێت بەر بە سیستەمە جیهانیەکان بگرێت. تۆ ناتوانیت ئەو یاسایانە جێبەجێ بکەیت کە تەنانەت پەیوەندی بە سەرپێچیەکانی هاتوچۆوە هەیە، لە ژێرباروودۆخێکی وەك ئێستای کوردستاندا هەرچەندە خەمساردی و کەمتەرخەمیش هەبێت بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە ئاستەنگی هەیە ئاستەنگی، کە ڕۆشنبیری بەکارهێن و بێبەرهەمیش یەکێکن لەو ئاستەنگانە، تا ئێستا ڕۆشنبیر کام پرۆسەیەی گرتەدەست بۆ فێرکردنی پۆلیسەکان تا شەقامیان خۆش بوێت، کام مامۆستایەت فێرکرد منداڵی خۆش بوێت کام سەرکردەیەت فێرکرد تۆ ڕابەری تیۆریەکانی بیت نەك ئوسامە یان بۆش. کام تیزە بە پێزەت خستە پراکتیزەوە بۆ ئەوەی سیستەمی بازاڕت لە قەیران ڕزگاربکەیت، پەراوەی کام گوشارەت کرد تا بەشێك بیت لە دەسەڵات، تەنها و تەنها لە نێوان

عەقڵی ڕۆژئاوا و عاتیفەی ڕۆژهەڵاتدا بە کۆمەڵە شیعرێك بۆ پرسە ترسناکەکانی ئەم وڵاتە فرمێسکەکان بەخوڕتر دەکەیت، ناتوانم ئەوەش بەڕاست بزانم کە بەبێ دەسەڵات، لایەنی کەم یەکێك لە جۆرە جیاجیاکانی، بتوانرێت بەشداری گۆڕان بکرێت. من ڕام وایە ئەوەی ڕۆژێك ئەرکی دەسەڵاتی لە ئەستۆ نەبووبێت یان بەرپرسیاری قۆناغێکی واقعی ژیانی خەڵکی خۆی نەبووبێت لەیەکێك لە بوارە گشتیەکاندا هەر لە قۆزاخە و جوغزە فکریەکانی خۆیدا حەشار خواردوو بووبێت ناتوانێت لەو وتارەی کاك بەختیار عەلی ناواقعیتربەرهەم بهێنێت.

کۆمەڵگای ئێمە باشترین ژینگەیە بۆ بەناوخۆییکردنی جەنگەکانی گلۆبەلایزەیشن نەك ئێمە بۆ خۆمان هەوڵی ئەو بە ناوخۆیی کردنە بدەین، ئەو تاوانبارکردنەی بەختیار عەلی لە توندوتیژی خود دژ بەخود بەولاوە زیاتر نیە ئەم ڕەهەندەی ئەو قسەی پێدەکات بۆ تێکشکانی کەسێتی خەڵکی ئەم ناوچەیە زیاتر لە بارە تا بەئاگا هێنانەوەی، لە شەڕی یەکێتی و پارتیدا کام ڕۆژ توانیت بەرنامەت هەبێت بۆ بەرگرتن لە مەترسیەکانی جەنگ جگە لە لێکدانەوەی ئەفسوناوی هیچیترمان نەبیست، تەنانەت بە قەدەر کرێکارە ژنەکانی (٣) کارگەی جگەرەت پێنەکرا، جارێکی تر بوو هەستی ناسکی خەڵکت دەلاواندەوە بە لام لە هیچ پرۆسەیەکی عەمەلیدا ئەنجامەکانت جێکەوتەی نەکرد، پێت وایە بەم پەیامەت دەتوانیت پرۆسە سیاسیەکانی ئەم وڵاتە دەوڵەمەند بکەیت یان ڕۆشنبیرەکان بە ئاگا بێنیتەوە یا خود ئەمە ختابی تۆیە بۆ بەرگرتن بە شەڕێکی تری ناوخۆ لە کاتێکدا شەڕەکانی ناوخۆ ئەگەر چەند فاکتەرێکی ناوەکیان هەبێت بە سەدان فاکتەری دەرەکیان هەبووە، ئەمە پارێزگاری نیە لە کلتوری یەکێتی و پارتی یان هەر حزبێکی تر. بەلام خەم ساردی و ترسنۆکی سیاسەتمەداری بێلایەن و ڕۆشنبیری مونتەمی بۆ گرۆکان

خەڵکی کوردستان دەست خۆشی کردنە لە لایەنەکان کە ئەوانیش بە مەعریفەتی خۆیان یاریە سیاسیەکان بەڕێوەبەرن، ئەوەی هیچیش نەکات حەتمەن هەڵە ناکات. بەڵام کەی توانرا سیاسیەکانی ناو دەسەڵات بکەونە ژێر کاریگەری ڕۆشنبیرەکانەوە کەی ڕۆشنبیرەکان توانیان تەرحی ستراتیژی کورت و دووریان هەبێت بۆ پرۆسە سیاسیەکان و پێشهاتە دەرەکیەکان، ئەوا دەتوانن بە سەلیقەو زانستیانە بەرەنگاری دیاردە دزێوەکان بوەستنەوە. هەڵاتن دەرئەنجامی ترسانە لە کردە، چونکە کردە بۆی هەیە ئاکامی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی هەبێت. من بە پێچەوانەوە دەڵێم کە ئێوەو مانان توانیوتانە ئیمپاکتە بەدەکانی گلۆبالایزەیشن لۆکاڵی بکەنەوە تا دەرفەت لە باربێت بۆ سیاسەتمەدارەکان کە بکەونە یاریە ترسناکەکانی جەنگی نێوان ترسناکەکانەوە. کامە ڕۆژ ئێوە توانیتان بگەنە ناوماڵەکان بۆ ئەوەی خەڵك بە ویستی خۆی ناوی خۆی لە زاناوە نەگۆڕێت بۆ ئوسامە، کامە ڕۆژ ئێوە توانیتان ڕۆڵەکانی خەڵك لە بەرەکانی جەنگەوە بگەڕێننەوە ناو ماڵەکانیان و شەڕی براکانیان نەکەن. کامە ڕۆژ توانیتان سەرکردەکان قایل بکەن هەڵبژاردنەکان گۆڕانی بەسەردا بێت. کامە ڕۆژ توانیتان بەشداری سیاسی بکەن و نەترسن. کاتێکیش ترسان و هەڵاتن لەو مەیدانانە یان شەرمۆك بوون یان لێتان نەزانی، ئەوا بەرەخنەگرتن ناتوانن قورتاربن لە ئەرکی مێژوویی خۆتان.

دواجار کە دەزانیت گرۆپەکی وەك جوند لئیسلام ترسناکەو بە تەنها لە ئەفغانستانەوە نەهاتووە لە گەڵ وەبەر هاتنی تالیباندا لە ساڵی ١٩٩٤ ەوە پرۆژە خۆپارێزیەکانی تۆ چی بوون. بم بەخشە کاك بەختیار بەڵام کاتێکیش تۆ پەیوەندیت بەوەوە نیە چەند کورد و عەرەبی ئەفغانی لە ناو جوندلئیسلامدا هەبێت و لێی تێنەگەیت منیش پەیوەندیم بەوەوە نیە نەزانێکی سیاسی

شیکردنەوەی سیاسی بۆ دیاردەکانی ناو ئەم کۆمەڵگایە هەبێت، دیارە بەڕێزیشت هیچ لە پەیوەندی و تۆڕە تێهەڵکێشە سیاسیەکانی سەردەمی گلۆبەلایزەیشن لە یەکدی جیا ناکەیتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی نازانیت قۆزتنەوەی هەل و ستراتیژی هەل قۆزتنەوە چین و کامانەن لە سیاسەتدا، من پێم وایە ئەوەی بیەوێت دەم لە سیاسەتەوە بدات دەبێت هەموو یاریەکانی ناو سیاسەتی پێ قبوڵ بێت، بەلام ئەوەی لێهاتوو بێت ئەوەیە بتوانێت یاری نوێ بدۆزێتەوە تەکنیکی نوێ بەرهەم بهێنێت، ئەوەی هیومانیستیش بێت دەبێت ئەو یاریانە لە خزمەت بیرۆکە هیومانیتاریەکانیدا بەکاربهێنێت. چونکە سیاسەت لە گەڵ سەرجەم فاکتەرەکاندا یەکانگیرە وەك فکر و بابەتە ڕۆشنبیریەکان نیە، قوتابخانەیەك هەڵبژێریت و ئەوەکانی تر فەرامۆش بکەیت یان ببیتە دژیان، سادەیە زۆر سادەیە، قوتابخانە سیاسیەکانیش زۆر جۆرن بەلام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە چۆن لەگەڵ هەموو پێشهاتێکی نوێدا چۆن خۆت نوێبکەیتەوە و بتوانیت لە ڕادە بەدەر کاریگەری و چالاك بوونی خۆت بسەلمێنیت.

(٥)

کوردستان لە پرۆسەی گلۆبەلایزەیشندا زۆر هەژارە، ڕۆشنبیرەکانیش یەکێکن لە هۆکارە سەرەکیەکان، نمونەی سەرگوزشتەیەکی کۆنی کوردەواری باس دەکەم لەسەر تێڕوانینی بۆ دونیا و خوێندنەوەی بۆ نمونەکانی وەك بەختیار عەلی: (کابرایەك خۆی و منداڵەکەی و گوێدرێژێکی بچووك لە ڕێگایەکدا دەڕۆن، کابرا منداڵەکەی باوەش گرتووە و گوێدرێژەکە بە دوای خۆیدا کێش دەکات، یەکەم کەس دەبینێت و دەڵێت، ((ئەو کابرایە چەند بێ ئەقڵە، بۆچی منداڵەکە ناخاتە سەر گوێدرێژەکە؟))، پاش قەدەرێك لە ڕۆشتن کەسی دووەم دەبینێت و دەڵێت، ((ئەو کابرایە چەند بێ ئەقڵە، بۆچی منداڵەکە ناخاتە بەرکۆشی خۆی

بەتەواوی سوود لە گوێدرێژەکە ببینێ بۆ خۆی و منداڵەکەی؟))، پاش قەدەری دووەم ئەوەش دەکات. پاش کەمێك کەسی سێیەم دەبینێت و دەڵێت، ((ئەو کابرایە چەند بێ ویژدانە بەزەیی بەو گوێدرێژە بچوکەدا نایەتەوە))، باس و خواسی ئەمیش قبوولێ دەکات و دوا جار گوێدرێژەکە لە کۆڵ دەکات و دەڕوات. دواهەمین کەس دێتە وەڵام و دەڵێت، ((ئەوە چ پیاوێکی بێمێشکە لە بری گوێدرێژەکە خۆی بووەتە گوێدرێژ!))، ئا ئەمەیە ئێستا ڕۆڵی ڕۆشنبیرەکان لە بواری ڕەخنەدا لە کوردستان)، لە ڕاستی دا نوسەر و بیریارەکانی وڵاتی ئێمە لە سەردەمی کلاسیکی و پاش سەردەمی کلاسیکیش نەیان توانیوە بەرهەمهێنی تیۆری و بیرێکی گلۆباڵی بن تا بتوانن تێزە ناوخۆییەکانی کوردستان بەرەو گلۆبەلایزەیشن بەرن، ئەمە بەتەنها بەس نیە بەڵکو نەیان توانیوە کارەکتەری فکری بەهێز بن تا ڕەوتە کرداریەکانی وڵاتی خۆمان و بزوتنەوەسیاسیەکانی ئاراستە بکەن، بەڵکو تەنها لە چوارچێوەی لاواندنەوەی سۆزەکانی جەماوردا کاریگەریان هەبووە ئەوەش بە پشت بەستن بە تیۆر و ئایدۆلۆژیای دونیای دەرەوە، کە ئەمە بۆ ئەدەبیاتی گەلان شیاو و لە بارە بەلام بۆ فکرێکی دیاریکراو ئاستەنگە، هەڵبەت من بەلامەوە گرنگ نیە کام تیۆری و فکری کام نەتەوە گلۆباڵی دەکرێتەوە ئەوەندەی بەلامەوە گرنگە کام فکری زانستی مرۆڤدۆست گلۆباڵی بکرێتەوە و بەلاشمەوە گرنگە زاناکان و ڕۆشنبیرەکان و بیریارەکانی وڵاتی ئێمەش شوێن کاریان لەو پرۆسانەدا دیار بێت.

گەر بەمێژوودا بچینەوە، لەڕووی سەربازیەوە لە دەرەوەی ئیسلامدا کورد ئەو کارەی نەکردووە کە هێرشی داگیرکاری بکاتە سەر ناوچە جۆرا و جۆرەکانی دەورویەری تا بتوانێت فۆرمی ژیانی کوردی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێت، تەنانەت هەوڵی ئەو چەسپاندنەشی نەداوە لە ڕێگای فکری ئیسلامی خۆیەوە(٤)، ..

شیکردنەوەی سیاسی بۆ دیاردەکانی ناو ئەم کۆمەڵگایە هەبێت، دیارە بەڕێزیشت هیچ لە پەیوەندی و تۆڕە تێهەڵکێشە سیاسیەکانی سەردەمی گلۆبەلایزەیشن لە یەکدی جیا ناکەیتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی نازانیت قۆزتنەوەی هەل و ستراتیژی هەل قۆزتنەوە چین و کامانەن لە سیاسەتدا، من پێم وایە ئەوەی بیەوێت دەم لە سیاسەتەوە بدات دەبێت هەموو یاریەکانی ناو سیاسەتی پێ قبولّ بێت، بەڵام ئەوەی لێهاتوو بێت ئەوەیە بتوانێت یاری نویّ بدۆزێتەوە تەکنیکی نویّ بەرهەم بهێنێت، ئەوەی هیومانیستیش بێت دەبێت ئەو یاریانە لە خزمەت بیرۆکە هیومانیتاریەکانیدا بەکاربهێنێت. چونکە سیاسەت لە گەلّ سەرجەم فاکتەرەکاندا یەکانگیرە وەك فکر و بابەتە رۆشنبیریەکان نیە، قوتابخانەیەك هەڵبژێریت و ئەوەکانی تر فەرامۆش بکەیت یان ببیتە دژیان، سادەیە زۆر سادەیە، قوتابخانە سیاسیەکانیش زۆر جۆرن بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە چۆن لەگەلّ هەموو پێشهاتێکی نوێدا چۆن خۆت نوێبکەیتەوە و بتوانیت لە رادە بەدەر کاریگەری و چالاك بوونی خۆت بسەلمێنیت.

(٥)

کوردستان لە پرۆسەی گلۆبەلایزەیشندا زۆر هەژارە، رۆشنبیرەکانیش یەکێکن لە هۆکارە سەرەکیەکان، نمونەی سەرگوزشتەیەکی کۆنی کوردەواری باس دەکەم لەسەر تێڕوانینی بۆ دونیا و خوێندنەوەی بۆ نمونەکانی وەك بەختیار عەلی: (کابرایەك خۆی و منداڵەکەی و گوێدرێژێکی بچووك لە رێگایەکدا دەڕۆن، کابرا منداڵەکەی باوەش گرتووە و گوێدرێژەکە بە دوای خۆیدا کێش دەکات، یەکەم کەس دەبینێت و دەڵێت، ((ئەو کابرایە چەند بیّ ئەقڵە، بۆچی منداڵەکە ناخاتە سەر گوێدرێژەکە؟))، پاش قەدەرێك لە رۆشتن کەسی دووەم دەبینێت و دەڵێت، ((ئەو کابرایە چەند بیّ ئەقڵە، بۆچی منداڵەکە ناخاتە بەرکۆشی خۆ

بەتەواوی سوود لە گوێدرێژەکە ببینێ بۆ خۆی و منداڵەکەی؟))، پاش قەدەری دووەم ئەوەش دەکات. پاش کەمێك کەسی سێیەم دەبینێت و دەڵێت، ((ئەو کابرایە چەند بێ ویژدانە بەزەیی بەو گوێدرێژە بچوکەدا نایەتەوە))، باس و خواسی ئەمیش قبووڵ دەکات و دوا جار گوێدرێژەکە لە کۆڵ دەکات و دەڕوات. دواهەمین کەس دێتە وەڵام و دەڵێت، ((ئەوە چ پیاوێکی بێمێشکە لە بری گوێدرێژەکە خۆی بووەتە گوێدرێژ!))، ئا ئەمەیە ئێستا ڕۆڵی ڕۆشنبیرەکان لە بواری ڕەخنەدا لە کوردستان)، لە ڕاستی دا نوسەر و بیریارەکانی وڵاتی ئێمە لە سەردەمی کلاسیکی و پاش سەردەمی کلاسیکیش نەیان توانیوە بەرهەمهێنی تیۆری و بیرێکی گلۆباڵی بن تا بتوانن تێزە ناوخۆییەکانی کوردستان بەرەو گلۆبەلایزەیشن بەرن، ئەمە بەتەنها بەس نیە بەڵکو نەیان توانیوە کارەکتەری فکری بەهێز بن تا ڕەوتە کرداریەکانی وڵاتی خۆمان و بزوتنەوەسیاسیەکانی ئاراستە بکەن، بەڵکو تەنها لە چوارچێوەی لاواندنەوەی سۆزەکانی جەماوردا کاریگەریان هەبووە ئەوەش بە پشت بەستن بە تیۆر و ئایدۆلۆژیای دونیای دەرەوە، کە ئەمە بۆ ئەدەبیاتی گەلان شیاو و لە بارە بەڵام بۆ فکرێکی دیاریکراو ئاستەنگە، هەڵبەت من بەلامەوە گرنگ نیە کام تیۆری و فکری کام نەتەوە گلۆباڵی دەکرێتەوە ئەوەندەی بەلامەوە گرنگە کام فکری زانستی مرۆڤدۆست گلۆباڵی بکرێتەوە و بەلاشمەوە گرنگە زاناکان و ڕۆشنبیرەکان و بیریارەکانی وڵاتی ئێمەش شوێن کاریان لەو پرۆسانەدا دیار بێت.

گەر بەمێژوودا بچینەوە، لەڕووی سەربازیەوە لە دەرەوەی ئیسلامدا کورد ئەو کارەی نەکردووە کە هێرشی داگیرکاری بکاتە سەر ناوچە جۆرا و جۆرەکانی دەورو بەری تا بتوانێت فۆرمی ژیانی کوردی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێت، تەنانەت هەوڵی ئەو چەسپاندنەشی نەداوە لە ڕێگای فکری ئیسلامی خۆیەوە(٤)، ..

پێچەوانەوە هەمیشە لە سەنگەری بەرەنگاری ئەوانیتردا بووە، یاخود ئەگەر ڕاستر بڵێین کاتێك هەوڵی بۆ ئەم مەبەستەش داوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە خزمەت تێز و بیرۆکەی دەرەکیدا بووە و ئەم مێژووەش لەخۆڕانیە، بەڵکو ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مەودایەکی دێرینتر.

باشترین نمونەش دەتوانین بۆ پەرەسەندنی تەکنەلۆژی بگەڕێینەوە، جیاوازیەکان بە ئاشکرا دیارن کە وڵاتی ئێمە حەزرەتی نالی بەرهەم هێناوە و ئەڵمانەکانیش مارکس لە هەمان سەردەمدا، ئەمە سوکایەتی کردن نیە بە ئەدەب و کلتوری کوردی ئەوەندەی واقعێکی تاڵە، لە سەردەمی زەقی گلۆبەلایزەیشنیشدا تۆ ئێوارەی پەروانەم بۆ بەرهەم دەهێنیت و ئەوروپایی و ئەمریکیەکان خەمی بەیەکدا چوونی بازارەکانیانە و هاوکێشەی ستراتیژی لەسەر ئەو بنەمایانە بۆ خۆیان دادەڕێژن، لەهەمان کاتیشدا بزووتنەوە ئیسلامیەکان بەو پەڕی توانا و تاقەتی خۆیانەوە لە سەر بنەما و بەراییەکانی کلتوری تۆ ڕێکخستنی سیاسی و سەربازی ئەنجام دەدەن کە هێمایەکی ئاشکرایە بۆ پەراوەکردنی خەباتێکی هوشیاریانە لەسەر ئاستی Grassroot، ئەمەش جارێکیتر شکستی ڕۆشنبیرەکان دەردەخەتاوە لە بواری ئەرکە هەنووکەییەکانیاندا.. ئەمە باسکردن نیە لە نا پێویستی ئێوارەی پەروانە کەی بەختیار عەلی ئەوەندەی باسکردنە لە ((کاتێك ڕێکامان بەخۆماندا باس لە بابەتێکی سیاسی بکەین و بیرۆکەی خۆمان بۆ خەڵك بەیان بکەین دەبێت لایەنی کەم بەقەدەر بابەتەکەبین چ لە ڕووی تیۆریەوە چ لە ڕووی پراکتیکیەوە.. لە لایەکیترەوە پارتەسیاسییەکان لەسەر کەلەپووری ڕۆشنبیرەکان کارناکەن، ئەمەش بەڕای من ئەوەندەی ڕۆشنبیرەکان بەرپرسن ئەوەندە پارتە سیاسیەکان بەرپرس نین، چونکە کاتێك دەسەڵاتی زانیاری دەیەوێت بەشداری

جدی بکات له پرۆسەی گۆڕاندا، ئەوا دەبێت کاریگەری لەسەر دەسەڵاتەکانی تر جێبهێڵێت و هەمیشەش وابووە کە تیۆر پێش پراکتیك کەوتووە ئەگەرچی پراکتیکیش بووەتەوە زەخیرەی نوێ بوونەوەی تیۆریەکان. جارێکی تر دەڵێم من ڕەتی ئەدەبیات ناکەمەوە ئەوەندەی دەخوازم خۆ ساخکردنەوەو بەرپرسیارێتی دیار و ئاشکرا بێت لە ناو ڕۆشنبیرەکانماندا، فکر و سیاسەتی گەلان گەر پشتی بە ئەدەبیاتیش بەستبێت ئەنجامەکانی بەتەنها لەسەر ئەو ئەدەبیاتە بە ئاکام نەگەیشتووە، فکرو سیاسەت بەرێژەیەکی سەرەکی لەسەر بنەما تەکنەلۆژی و واقعە سیاسی و سەربازیەکانی ناو بازاڕ پایەگا کاریگەرەکانی خۆی بونیاد ناوە و دەینێت)).

لە ڕووی فەلسەفیەوە ئەو بەرهەم هێنانە فکریە نیە کە خوێندنەوەی بۆ سەرجەم بەشەریەت هەبووبێت تا بە ڕیتمی فکری کوردی کاریانکردبێت و کاریگەریان لەسەر سەرجەم مرۆڤایەتی هەبووبێت وەك ڕووسەکان، یۆنانیەکان، ئەڵمانەکان، فەرەنسیەکان، ئینگلیزەکان، ئەمریکاییەکان و تەنانەت عەرەب و فارسەکانیش. لەکاتێکدا هزرمەندی کورد زۆر کات لەبەرەی پێشەنگی تیۆریزەکردنی ئایدۆلۆژیاکانیتردا کاریانکردووە و سەرکەوتووش بوون.

ئا ئەمەیە گلۆبەلایەزەیشن درووست دەکات و بۆ خەڵکانی تر دەبێتە خۆماڵیکردن، سەرەڕای ئەم دیاردە فکری و سیاسیانەش کوردستان نەیتوانیوە کاراکتەرێکی بەهێز بێت لە بازاڕە گرنگەکانی جیهاندا و لە ڕووی ئابووریەوە کاریگەری ناوچەیی خۆی بسەپێنێت، کە ئەوەش بۆ واقعێکی ئابووری سیاسی دەگەڕێتەوە کە لێکدانەوەی چڕ و پڕ هەڵدەگرێت. لەبەر ئەم هۆکارە بابەتیانە دەخوازێت خەڵکی کوردستان زۆر بە سانایی ڕەزامەندی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەو

خۆی خۆی پیشان بدات بەرامبەر گلۆبەلایزەیشنە جیاجیاکانی ئەمڕۆ ئیسلامی، سەرمایەداری یان هەر بیرێکی تری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. خۆ ئەمەش ئەرکی سەرشانی حیزبە سیاسیەکان نیە! لە سەردەمانێکدا پیرەمێردی شاعیر لەسەر شێوازی شیعری فەلسەفی لەم جۆرە تێزانەی بۆ کۆمەڵگای کوردی هەبووە کە هیچ ئەلگۆیەکی سیاسی و پراکتیکی ئاستەنگ نەبوون لەبەردەم ئەو دیاردە و خوێندنەوەیە بۆ بیری مرۆڤایەتی، هەر بەوەندەشەوە نەوەستاوە بەڵکو هەنگاوی عەمەلیشی ناوە لەو پێناوەدا. بەڵام لە پاش پیرەمێرد و هەندێکی کەمی وەك پیرەمێرد کام لە بیریار و ڕۆشنبیرەکان توانیان ئەو ئاکتەرە چالاکەبن لەو بوارەدا و خوێندنەوەی کوردیان هەبێت بۆ دیاردەکانی سەردەم و ئەوەندە کاریگەر بێت کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە چین و ئوسترالیا و جەزائیر دا کاری پێ بکات؟

سەردەمی شیعر و فکری کلاسیکی تێپەڕی، بۆیە من لێرەدا و لە مەسەلەی گلۆبەلایزەیشندا بەختیار عەلی تاوانبار دەکەم بە نامۆ بوون بەرامبەر عاتیفەی ڕۆژهەلاتی و عەقڵی ڕۆژئاوایی، چونکە ناتوانێت لە ڕووی ئەدەبیەوە قورتار بێت لە لاواندنەوەی هەست و سۆزی شاعیرانەی کۆنی تێپەڕبووەکانی خۆی و ناتوانێت دەرباز بێت لە لاسایی کردنەوەی عەقڵی خۆرئاوایی، تەنانەت وەك هزرمەندە خۆرئاواییەکانیش ناتوانیت کەرەستەو تەکنیکی سەردەم بەکاربهێنێت بۆ پەراوەکردنی دەسەلاتی عەقڵی خۆی.

کاتێك کۆمەڵگا و مرۆڤی ئەو کۆمەڵگایە دەتوانن خۆماڵیەکانی خۆیان گلۆبەلایزە بکەن، کە:

١. ئەگەر تەکنەلۆژیایەکی سیاسی یان ئابوور بەهێزیان هەبێت و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی نەتوانێت دەست بەرداری ببێت.

٢. ئەگەر فکرێکی مرۆڤایەتی بەهێزی هەبێت و لە لای زۆربەی کۆمەڵگاکان ببێتە ریتم و پرۆگرامێك یان شێوازێك بۆ ژیانی کۆمەڵگاکانیان.

٣. ئەگەر دەسەڵاتێکی سیاسی و سەربازی ئەوتۆی هەبێت کە بتوانێت پەراوەی هاوزاڵێتی سەربازی و سیاسی بکات بەسەر ناوچەیەکی سیاسی یان پانتاییەکی جیهانیدا یا خود رۆژێك لە رۆژان کردبێتی.

بۆیە بە ناچاری لۆکاڵی دەرەوەی کوردستان گلۆباڵی دەبێتەوە لە سەر واقعی کوردستان، ئەمەش بەتەنها ئەرکی سیاسیە دەسەڵات رەهاکان نیە! ئەوەندەی ئەرکی رۆشن فکر و خۆ بە هزرمەند زانەکانی کوردستانە. بەڵام کاتێك ئەو گرۆ دەستە بژێرەی خەڵك نەتوانێت ئەو رۆڵە ببینێت، ئەوا سیاسەتمەدار و گرۆ کۆمەڵایەتیەکان تارادەیەك بێ تاوانن لە پەراوەی ئەوەی کە ئەوان هۆشیان بۆی ناچێت. یان لایەنی کەم ناتوانرێت خوودی رۆشنبیری سالب ئەو ئەرکەی پێ ببەخشرێت.

تارادەیەکی زۆر ئەدیبە کۆنەکانی کوردستان بێتاوانترن لە رۆشنبیرەکانی ئەمرۆ، چونکە راستە جوگرافیای سیاسی کۆن لە بارتربووە لە رووی کارگێریەوە بۆ کارکردن، بەڵام تەکنۆلۆژیای ئەمرۆ و پەیوەندی مرۆڤەکان بەیەکدیەوە هیچ بیانوویەکی نەهێشتوەتەوە بۆ ئەو کۆسپانە. لە راستیدا من بروام وابوو تا سەردەمانێکیش کە ئەکرێت نەوەی نوێی رۆشنبیرەکانی وڵاتی ئێمە بتوانن ئەو ئاستە ئاستەنگەی بیری کۆن تێپەرێنن، بەڵام گەر خوێنەرێکی ئاسایی چەندە بە وتارەکەی بەختیاردا بچێتەوە ئەوەندەی تر پاشە رۆژی لا

تاریکتر دەبێت و هیوای مەزنی نابێت کە بتوانێت وەك سیاسەتمەدارێکی بێلایەنی حزبی گەشە بکات و تێزی جودای هەبێت. هەرچەندە ئەمە بونیاد نانی خەونێکی یۆتۆبی تر نیە لەسەر فکری بەختیار، بەڵام ئاستی هوشیاری خەڵك و هەوڵی موتڵەقکەرایی بەختیار عەلی، ئەوە بەرهەم دەهێنێت.

(٦)

ئەوەی ئەمرۆ لە گلۆبەلایزەیشنی دەبینین وەك هەموو سەردەمە تراژیدیەکانی تر سەر ئەنجام و بەرهەمی گلۆبەلایزەیشنێکە کە سەرەتاکانی بە گلۆبەلایزەیشنی ئابووری دەستی پێکرد و پاشان تەشەنەی کرد بۆ بوارەکانی تر. هەر بۆیە ئەم پرۆسەیە لە هیومانیستە فریشتەکانەوە نیە بۆ دەرەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوەیە. لەیەکدانی هەموو دونیا لە یەك سیستەمدا کارێکی کۆنەو درێژکراوەی پرۆسەکانی داگیرکاری و ئیمپراتۆریەتەکانە، کە لە سەردەمەنوێکاندا بەرگی کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم و ئینترناسیۆنالیزمە جیاجیاکانی بە بەردا کراوە، ئەمەش درێژکراوەی ئەو سەردەمەیە و لەگەڵ نوێ بوونەوەی پرۆسەکەدا ناوەکەشی نوێ بووەتەوە. ئەمانە هەمووی لە کۆندا بە هۆی سەرداریی سەربازی و سیاسیەوە ئەنجام دراون، بەڵام ئێستاکێ سەرداریی زانیاری و گۆرینی کۆمەڵایەتی و سیستەمی حوکمڕانیشی گرتوەتەوە. بۆ بەرگرتن بەم پرۆسەیە پێویستی زۆری دەوێت، کەیەکێك لە هەموویان گرنگتر ئەوەیە کە ناتوانرێت تەکنیکەکانی فەرامۆش بکرێن، و بەکارهێنانی تەکنیکەکانیشی ستەمە بە بێ ئەوەی بکەویتە ژێر کاریگەری یەکێك لە هێزە گەورەکانەوە و بە ئاقاری قازانجی خۆیدا نەیبات. ئەوەی ئەمرۆ گرۆ ئیسلامیەکانی وەك جوند ولئیسلام وابەستەی بوون تەنها ئەوەیە کە باوەڕی وایە لە گەڵ ستراتیژی زل هێزێکی دونیادا یەکیگرتووەتەوە کە ئەویش

مەسەلەی ئیمانە بە بەها پیرۆزەکان کە خودی خۆیان باوەڕیان پێیەتی و باوەڕ پێ بوونەکەشیان لە ڕووی مەنتقی بەربەرەکانی نێوان ئەو دوو جۆرەی گلۆبالیزمەوە تا ڕادەیەکی زۆر درووستە، لە ڕاستیدا مەنتقی ئەم شەڕە مەنتقی جیاوازی نێوان دوو بیروباوەڕ و پاشان جیاوازی نێوان دوو بەرژەوەندی و جیاوازی نێوان دوو دەسەڵاتە. کاتێکیش دێینە سەر پارتە سیاسیەکانی کوردستان بە هەمان شێوە مامەڵە لە گەڵ سیاسەتی ئەمریکی و ڕۆژئاواییدا دەکەن. ئەم واقعە لەسەرجەمی یاریەکانی علمانیەت و ئاسمانیەتدا مەلە دەکات، ئەگەرچی لە ڕووی دامەزراوە زانیاری و سیاسیەکانیشدا لە دەرەوەی واقعی فکری و سیاسی کوردستانەوە هاتبن یان لە دەرەوەی عەقڵی سیاسی کوردیەوە هاتبن، بەڵام لە ڕووی کرداریەوە دەچنەوە خولگەی هەمان بەریەرەکانی. چەند جەمسەرێك هەیە ئەم شێوازەی ژیانی پێ ڕەوایە بەم جۆرە دەیەوێت پەراوەی دەسەڵات بکات بەرژەوەندیەکانی بەم جۆرە دەپارێزرێن، چەند جەمسەرێکی سیاسی تریش هەیە بە پێچەوانەوە. بۆیە ئەمڕۆکە ئێمە لە پرۆسەیەکی هاوتەرییداین لەئاست دوو ڕۆشنبیری جیاوازدا و ڕای سێیەم نیە، چونکە ڕای سێیەم و چوارەم کاتێك بوونیان بۆ دەژمێردرێت کە بوونەکەیان موڵکی خۆیان بێت، دەنا بەتەنها ڕەتکردنەوەی هەردوو تێزەکە بریتی نیە لە بوونێکی تر. بۆش کاتێك داوای هەڵوێست دەکات و دەڵێت لە گەڵمای یان دژمیت؟ داوایەکی واقعیە چونکە بۆ خودی سیاسەتی ئەمریکی گەیشتووەتە ئەو یەقینەی کە بەرەی سێیەم لەماوەی ڕابردوودا ئامادە نەبوون، بۆش یان سیستەمی ئەمریکی بزووتنەوەی چەپەکانی لە لای خۆی دەمێکە فۆرماتکردووە، بۆش یان سیستەمی ئەمریکی ترسی لە بزووتنەوە ئەتنیکیەکان دەمێکە ڕەوییوەتەوە، هەروەها بۆش هیچ بەرەیەکی فکری و سەربازی و

ئابووری و دەسەڵات وەك دەستێكی مەترسی دار بۆ خۆی نابینێتەوە تا هەژماردیانكات لە دەرەوەی هاوكێشەی لە گەڵمایت یان دژمیت. تەنانەت كلتور و ڕۆشنبیریەكی لۆكاڵی بەهێزیش شك نابات تا مەترسی بزاوتنی كاریگەری لێبكات. جا لێرەدا من قسەم لەسەر ئەوەنیە چەندێك سەرۆكی وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمەریكا ئەم گوتارەی لە هەست و لێكۆڵینەوەوە بونیاد ناوە یان لە نەستی سیستەمەكەیدا سەقامگیر بوویێت، گرنگ ئەوەیە لەسەر پانتایی كرداری بازاڕ و هێز هێماكان ئاشكران.

سیستەمی ئەمریكی ڕووكاری سیستەمی حەوت جۆر لە منۆپۆڵكردنە:

١. مۆنۆپۆڵی فكر و ئایدۆلۆژیا بگۆڕەكان، بە پەراوەكردنی سیستەمی دیموكراتی، كام دیموكراتیەت؟ ئەودیموكراتیەتەی كە دیكتاتۆریەتی سەرمایەیە.

٢. مۆنۆپۆڵكردنی دەزگاو دامەزراوە داراییەكان.

٣. مۆنۆپۆڵی بڕیارە سیاسیەكان، بە پەراوەكردنی بڕیاری سیاسی ئەمریكی بە پێی شەرعیەتی دەولی.

٤. مۆنۆپۆڵكردنی كەرەستە سەربازیەكان، بە پاشەكشەكردنی تەكنەلۆژیای سەربازی سۆڤێتی و نەبوونی بەربەرەكانی بەرامبەر بازاڕی چەك و دەسەڵاتی سەربازی ئەمریكی.

٥. مۆنۆپۆڵكردنی كەرەستەكانی ڕاگەیاندن، بە داڕشتنەوەی گوتاری ئەمریكی لە ڕێگای دەسەڵاتی حوكمەتە جیاجیاكانەوە.

٦. مۆنۆپۆڵكردنی سەرچاوەكانی زانیاری.

٧. مۆنۆپۆڵكردنی تەكنەلۆژیای سەردەم.

لەساتێکدا کە سیستەمەکانی دەرەوەی بازنەی سەرمایەداری توانای تێپەڕاندن و ڕاست بوونەوەیان نیە لە ئێستادا بەرامبەر ئەو مۆنۆپۆلکردنانە.

وەك فکر لیبرالیزم و لیبرالیزمی نوێ دوو دیاردەی بەرهەم هێناوە، ئازادی و سەرمایەداری جیهانی، سەرمایەداری جیهانی بنەماو کەلەپورێکە بۆ گلۆبەلایزەیشنی ئەمرۆ، بەڵام ئەمە ناوەڕۆکی پەیامی لیبرالیزم نیە، لە هەمان کاتیشدا ناوەڕۆك و مەغزای سەرمایەداریشە لە دونیای ئەمڕۆدا کە کارلێکێکی پێچەوانەی دروستکردوە لە گەڵ لیبرالیزمدا بۆ پێکهێنانی ئاوێتەی فکر و دەسەڵات.

ئەمڕۆ دونیا بەرامبەر گلۆبەلایزەیشنێکی دوو جەمسەرە، هەردوو جەمسەرەکە پەراوەی خۆیان دەکەن بۆ بەئەنجام گەیاندنی پرۆسەکانیان. ئەرکی سەرشانی بزووتنەوە هیومانیستیەکان ڕەخنە گرتنە لە ڕۆشنبیری و کلتوری ئەو گلۆبەلایزەیشنە نەك بونیادنانی خەونی یۆتۆبی لەسەر ئیمپاکتە ستاتیکیەکانی ئەو گلۆبەلایزەیشنەی بەدوای خۆیدا ئەگەری درووستکردنی سەددان جەنگی تری پێیە و لەسەرەتای درووست بوونیەوە لەسەر جەنگ گەشە دەکات. دووەم خاڵ ڕەتکردنەوەی کارکردنە بەو ستراتیژانەی کە گلۆباڵیستەکان کاری پێدەکەن، لەوانەش تێکشکاندنی هزری نەوەی نوێ. سێیەم و لە هەموویان گرنگتر چۆنێتی ڕزگار کردنی مۆنۆپۆلکراوەکانە لەژێر دەسەڵاتی گلۆباڵیستەکانی ڕادیکالیزمی سەرمایەداریدا.

گەر کەمێك بگەڕێینەوە سەر تەوەری دووەمی ئەمڕۆی گلۆبەلایزەیشن کە بریتیە لە جیهانی ئیسلامی، ئەوانیش تەکنیکی تاڕادەیەك سەرکەوتووی خۆیان

لەبن دەستەو کاری پێدەکەن. هەر وەك باسمانکرد شەڕشەڕی گلۆبەلایزەیشنی ئابووری و بازاڕە جیاجیاکانی بەرهەمهێنانە، کاتێك فکر دەبێتە یەکەمین قوربانی! ئەو لادنە پڕ پلانەی کە کاك بەختیار دەیەوێت بچووکی بکاتەوە، یەکەم کەس بووە کە بە بەیانێکی سیستەماتیك و شیکردنەوەیەکی زانستی (بەپێی ئیسلام) داوای لە ئیسلامەکان کردووە دوورکەونەوە لە کڕینی کەرەستەو بازاڕی ئەمریکی، تەنانەت یەکێکە لە لۆبیستەکان لە سەر درێژە پێدانی سیاسەتی توندڕەوکارانەی کۆمارە ئیسلامیەکان و نەتەوە ئیسلامیەکان بەرامبەر ئەمریکا. دەرکردنی بەیاننامەکەی بن لادن دژ بە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا، کە پێکهاتووە لە دوانزدە لاپەڕە، لە خۆڕا نەهاتووە، هەمیشە دەزانن لە چ گۆشەیەکی بەردەکان دەدەن و چۆن جۆشی جەماوەر و دونیای ئیسلامی دەدەن. خۆ لە خۆڕا ئەمریکایەکان باس لە شەڕی چارەکە سەددەی ناکەن، ڕای دونیای دژ بە ئەمریکا لە پاڵ ڕای جەماوەری ئیسلامی و لەگەڵ بزووتنەوە ئیسلامیەکانە، کە لایەنی کەم یەك شەشی دیمۆگرافیایی لەناوچە گرنگەکانی دونیا پێکدەهێنن، ئەمانە گەر وەك حکومەتیش نەبێت وەك گەلان زەمینەی لە بارە. هەروەها چۆن بۆش کوڕی کلتوری خۆیەتی ئاواش ئەو حکومەتانەش کوڕی کلتوری خۆیانن.

فکرەکاریگەرەکانی دونیا بە نمونە باسیان دەکەم و مشتێك لە خەرمانێك، مارکسیزم، کەسانێك هەبوون تەرجەمەی بکەنە سەر تیۆر و پراکتیك بۆ ژیان و کرداریان پێکرد و دەستیان وەردایە مێژوویەك کە سەددەیەکی خایاند. ناسیۆنالیستەکان هەندێك دەوڵەت و ئیمپراتۆریێتی زەبەلاحیان بەرهەم هێنا. ئیسلامەکان دەنگێکی زوولاڵی دیمۆگرافیایان بەدەست هێناو خاوەنی چەند ئەمارەتێك بوون تا ئێستاش لە سەر کەلەپووری ئەو ئەمارەتانە دەژین.

لیبرالیزم پشت بە ئازادی بازاڕ و بەرهەمی نوێ و خۆ نوێکردنەوەی سیستەمی بازاڕی ئازاد و ئابووری ئازاد، سەرمایەداری نێودەوڵەتی و کۆمپانیا فرە نەتەوەکانی بەرهەم هێنا کە ئێستا ئەوانە حاکمی موتڵەقی پانتاییە فراوانەکانی دونیان و خۆیان بە بێبەری دەزانن لە جەورستەمە سیاسیەکانی ئەمڕۆی بەشەریەت لە هەرکوێك بێت و بە پێچەوانەوە خۆیان بە چارەسەری ئەو جەوروستەمانە دەزانن. هەموو ئەمانە بەدەر نین لە بەهای جوان، هەروەك چۆن سیاما و سەددای ناشرینیشیان هەیە. بەڵام کلتور و فکرێك کە بەتەواوی هیومانیست بێت نەی توانیوە لە تێز و ئاکارێکدا خۆی لە هەموو خەوشەکان پاك بکاتەوە، پاشان کەسێك نەهاتووە و بەم بیرۆکانەوە نەکەوێتە گێژاوی یاریە سیاسی و تەکنیکە سیاسیەکانەوە کە ناکرێت هیچ سیاسەتمەدارێك خۆی لێ بەدوور بگرێت.

باشە کوا ئەو سەرکردە سیاسیەی لەنێوەندە هیومانیستیەکانەوە گەشەیکرد و تەکنیکی سیاسی برد بەڕێوە لە بەرامبەر دژەکانیدا، ڤێزەونەکاندا، و ناچار نەبوو ڤێزەون ببێت؟ ئەی کوا ئەو هەموو وشە جوانەی لە گوتاری هزرمەندە هیومانیستەکاندا لە واقعی سیاسیدا کاری پێدەکرێت؟ ئەوەی تۆ داوای دەکەیت کە ئەو هێزانە نەدەن بەیەکدا، دەتەوێت و دەخوازیت بەشەریەت و کۆمەڵەکەی ئێمە نەکەوێتە ئەو گەمەیەوە؟ ئەمە چەند و چۆن واقعیانەیە؟ لە کاتێکدا کە لە کاری ڕەخنەیی بەدەر هیچ کردگارێکی پێ ئەنجام نەدراوە. ڕەخنەگرتنی سیاسی ئەرکێکی سیاسیە لە خودی خۆیدا، چونکە سیاسەت وەك زانستێك لە زانستە مرۆڤایەتیەکان، بریتیە لە پیاچونەوەیەکی بەبەرنامەی بەردەوام، یان گونجاوترە بڵێین ڕەخنەگرتنێکی بەبەرنامەی هەمیشەییە بۆ ئەو تیوری و

میکانیزمە کۆمەڵایەتیانەی بارودۆخی ژینگەی مرۆڤایەتی بۆ سیستەمە سیاسیەکان.

سیاسەت وەك کەرەستەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ بەرەو باشبردنی ژیانی مرۆڤ شتێکی جیاوازترە لەوەی کە ئێمە وەك چالاکیەکی دەسەڵات گەری سەیری بکەین، کە تەوەرەی سەرەکی تیایدا حوکمکردن بێت. سیاسەت وەك کەرەستەیەکی کۆمەڵایەتی دروست بەکارهێنراو، چالاکییەکی مرۆییە کە تەوەرەی سەرەکی تیایدا مرۆڤە. پەیوەندی حاکم بە حوکمکراوەوە یەکێکە لە خەسڵەتە ئاشکراکانی چالاکی سیاسی و چالاکییەکانی مرۆڤایەتی بەگشتی، گەر ئەم پەیوەندیە نەبێت سیاسەت نابێت دواتر دەوڵەت نابێت و زانستێکیش بە ناوی سیاسەت بوونی نابێت. ئەم سۆنگەیە بەسە بۆ ئەوەی بڵێین زانستی سیاسەت ئامانجی سەرەکی تێیدا تێگەیشتنە لە ڕاستی پەیوەندیەکانی نێوان حاکم و حوکمکراو، پاشان ئاراستەکردنیان لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتی. تەنها لەم ڕستەیەشدا من ئەرکی ڕەخنەگرتن بە ڕەوا دەبینمەوە کاتێکیش ڕەخنە دەگیرێت کە بە هەموو ئاراستە و هۆکار و دەستەواژە لۆژیکی و واقعیەکانی دیاردەیەك ئاشنا بووبین و لە نزیکەوە کارمان تیاداکردبێت و کاریان تێکردبین. ئەمەش ئەوەناگەیەنێت کە دەبێت لە سەر ئاستی حزبی پەراوەی سیاسی بکرێت یاخود ئەرکی ڕۆشنبیر تەنها ڕەخنەگرتن بێت و هیچیتر، لە ڕاستیدا سیاسەت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەرکی هەموو کۆمەڵگایە و پەراوەیشی دەکەن بەڕاستەوخۆییش پیشەی سیاسەتمەدارەکانە و مانای وانیە کەتەنها سیاسەتمەدار دەبێت لە پانتاییەکی حزبیدا چالاکیەکانی خۆی پەراوەبکات.

لە میانەی ئەم باسەشەوە پرسیارێکی تر بۆ من دێتە ئاراوە کە ئەویش، کەی ڕۆشنبیر سەری لێدەشێوێت؟

کاتێك ڕۆشنبیر نەیتوانی واقعی خۆی بخوێنێتەوە و لە جوغزەکانی خۆیدا خولایەوە! یان کاتێك خوێندنەوەی واقع ناچاریکرد ڕاستیەکان بە پەردەپۆشکراوی ببینێت! کاتێك هزرمەند نایەوێت بەشداری پراکتیکی گۆڕان بکات یان لە واقعدا بەشداری ناکات، ئەوە سەرئەنجامی ئەو سەرلێشێوان و پەرتەوازە بوونەیە لە ئەندێشەکانی خەیاڵات و خەونە پەمەییەکانی ئەو هزرمەندانەدا. بۆیە باشترە بیری تیژ و خەیاڵاتی جوانی خۆیان بەرەو ئەدەبیاتی سەردەم بەگەڕ بخەن، چونکە لێکدانەوەی سیاسی و تیژی سیاسی بەوانە نایەتە بەرهەم، گەر خۆشیان پێیان وابێت کە لە دەرەوەی بازنەی کاری سیاسیدا یان ئەزموونی سیاسیدا دەتوانن بە ڕەخنەی سۆز هەژێن و هاوشێوەی ڕەخنەی ئەدەبی کاریگەری لەسەر واقعی سیاسی بەرجەستە بکەن.

لە پانتاییە سیاسیەکاندا پێویستە هزرمەند هیوای گۆڕان و گورو تینی گۆڕینی تیادا هەبێت، هەروەها ئامادەبێت کاربکات ئەگەر چی بە دڵنیایەوە هەموو کات بەرئەنجامی کارەکانی پۆزەتیڤ نابن. ئا لێرەدا دوو جۆر بوێری مەرجن و مەرجی پێشینەیی خوازراون، بوێری کارکردن بۆ گۆڕان و بەرەنگار بوونەوەی تەنگژیەکانی ئەو کارە، دووەم بوێری لە ئەستۆ گرتنی بەرئەنجامی هەڵەکانی کارکردنی سیاسی لە پێناو گۆڕاندا. کە ئەمانە هەمووی لە هەڵوێستدا خۆیان دەبیننەوە، کارێکی ئاسانە ڕاستەوخۆ خۆمان بهاوینە داگرتنەوە و تێکشکاندنی دیاردە و سەرئەنجامەکانیان، بەڵام لە ئەستۆگرتنی ئەو بەرپرسیارێتیانە زۆر زیاتر گرانە.

سەددەی بیست و یەك كە بەختیار عەلی باسی دەكات هیچی ترنیە بەدەر لە درێژەی سەدەكانی ڕابردوو هەروەها ژمارەی سەدەكانیش تەنها بۆ تۆمارە، كات و ماوەكاتیەكان تەنها بۆ ناسینەوەی دیاردەكانە، شەرم لە دیاردەكاندایە نەك لە سەدەكاندا ئەوەی شەرمتریشە ئەوەیە لە بەرامبەر دیاردەكاندا ڕۆشنبیر ببێتە تەماشاوان. ئەمەیە سەرەتای یۆتۆبیا كە خۆبەستنەوە بە كاتێكی دیاری كراوەوە دەست پێدەكات و ڕۆشنبیر وا بزانیت ئیتر تەواو بەڵكو سەرجەم كاتەكان درێژەی یەكترن و بەو شێوەیە ئەفسووناوی نیە بە هاتنی سەددەیەكی نوێ هەموو بیركردنەوە و دیاردەكان بگۆڕرێن. سەرەتای دەست پێكردنی پەرەگرافەكانی بەختیار عەلی، خۆی لە خەمی بەرپرسیارێتی بەدوور دەگرێت و دەیەوێت بڵێت ئەوە هەڵوێستی منە ((نا بۆ سیاسەتی ڕۆژئاوا، نا بۆ سیاسەتی ڕۆژهەڵات، نا بۆ حیزبە كوردستانیەكان بە گەورەو بچوكەوە، نا بۆ ئیسلامیەكان، نا بۆ هەموو ئا كانی ئەم سەردەمەو منیش ئا كەی خۆم هی خۆمە و بۆخۆم))، جا گەر ئەمە ئەركی هزرمەند بێت، ئەوا با بەرەوانبێژیەكی جوان هەموو بە كۆرسێك پێكەوە بڵێین نا! خۆ ئەگەر فەلسەفەشە هەموو دەمێكە دەڵێین تەنانەت زۆر پێش ئێمەش وتوویانە نەفرەت لە شەیتانەكان و سڵاو لە فریشتەكان.

گەر بمانەوێت زانستیانە و بابەتیانە لە تەوەرەكانی ئەم جەنگە بدوێین ئەوا بەتەنها تیرۆر نیە كە رووخسارێكی پێبەخشرا بێت، بەڵكو لە هەمان كاتدا جیهادیش ڕووخسارێكی هاوشێوەی پێ بەخشراوە. ئەمانە سەرجەم بۆ

پرۆسەیەکی گەورەتر ئەنجام دراون کە ئەویش دەسەڵاتە لە نێوان ڕەوتی گلۆبالیزم و پلانی گلۆباڵیستە جیاوازەکاندا.

دونیای ئیمڕۆ و دوێنێ جیاواز نیە بەرامبەر تیرۆر و جیهاد، ئەوە کاتێك بۆ تۆ دەرکەوتووە کە ڕقەکانیان بە کوشتن بەیان دەکەن؟ ئائەمەیە قەیرانی ڕۆشنبیرەکانی ئەم سەردەمە، ئەی چنا هەستکردن بەم قەیرانانە و وەحشە شاراوەکانی ناو ئەو دوو جەستەیە لەبەیانی گرۆ ئیسلامیەکاندا بەدی ناکرێن یان لە خەلاتەکانی کلنتۆندا، کە ئەگەرچی پێویست بوو هەر لە سەرەتای نەوەتەکانەوە ئەم دیاردەیە هەستی پێبکرابایە. بەدڵنیایشەوە تا مرۆڤدۆستەکان تەرحی عەمەلی و چالاکیان نەبێت تا ڕۆشنبیرەکان لە قۆزاغە نەیەنە دەرەوە بەردەرگای جەنگەکان چۆڵ نابن.. قەیرانەکان لەوەدایە لە پاش هەشتاکانی سەددەی ڕابردووەوە مەودا سیاسیەکان و سیاسەتمەدارەکان زۆر بە سانایی کاریگەری لەسەر دەسەڵاتی ڕۆشنبیر و هزرمەندەکان جێدەهێڵن و بە پێچەوانەوە ئەوان ناتوانن نەخشە سیاسیەکان بەبارێکی تردا وەرچەرخێنن. گیرۆدەبوونی ئەو دەستە هەڵبژاردەیەش بەکلتورێکی دیاریکراوەوە لە لایەك و دووجەمسەری پێشکەوتنە تەکنۆلۆژی و ئاڵۆزبوونی بارودۆخە ئابووریەکان لە لایەکیترەوە، هۆکارێکی سەرەکیە بۆ نەزۆکی بەرهەمهێنانی بیرێکی پۆزەتیڤ کە توانای لە ئەستۆگرتنی کۆکردنەوەی داتا و لێکدانەوەی داتا و بەرهەمهینانی تێزی سیاسی زانستی هەبێت بۆ کاری عەمەلی گۆڕینی پایەگا سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان. ستراتیژ ستراتیژی جیاوازترکردنی جیاوازیەکانە، ستراتیژ ستراتیژی دەرفەت نەدانە بە پراکتیزەکردنی ئەو تێز و ئامانجە تەبایانە کە بەرەی دەرەوەی دەسەڵات باوەڕیان پێیەتی.

لەم پانتاییەدا کە کاری فکری و سیاسیش دووچاری بووە ڕۆشنبیرەکان و خۆ بەهزرمەند زانەکان بوونەتە داینەمۆیەکی چالاك بۆ هەڵسوڕاندنی هوشیاریە بەکاربراوەکانی سەردەمی گلۆبەلایزەیشنە جیاوازەکان، و متکردنی بە دیارکەوتنی جیاوازی بنچینەیی لە سەر ئاستی مرۆڤدۆستی و هاوکێشەی باش و باشتر و باشترین ئەلتەرناتیف لە پانتایەکاندا سڕاونەتەوە، کە جارێکی تر هیچ کام لە ڕاکان ناچنە ژێر باری ئارگیومێنتی لۆژیکی و زانستیەوە، بەڵکو سەرجەم لە لۆژیکی بەرژەوەندیەکانی دەسەلاتدا گەمەی سیاسی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەو خۆ دەکەن کاتێك ئینتیما دەکەن بۆ دەسەلات کاتێکیش ئینتیما ناکەن گەمەیان پێدەکرێت.

لێرەدا و لە پانتاییە سیاسیەکانی سەردەمی گلۆبەلایزەیشنی ڕادیکالیزمی سەرمایەداری و فەراهەم بوونی کەرستە جیاجیاکاندا بۆ پەیوەندی و دایەلۆگ، لە بانگەشەی قەشنگ و جوان بۆ دیموکراسیەت و ئازادی ڕادا، تا چ ئاستێك ڕۆشنبیرەکان دەتوانن سەرجەمی کۆمەڵگاکان بە ئاراستەیەکی هیومانیستیدا بەرن. کۆمەڵگاکان و مرۆڤەکانی بەرهەم و زادەی کلتوری خۆیانن کە هیچ کام لەو کلتورانە بەدەرنین لە پاکی و پیسی یان وەك فەلسەفەکانیان دەڵێت بەدەر نین لە چاکە و خراپە یان خێر و شەڕ. کارکردنی خاوەن بەرژەوەندیەکان لە بواری سیاسیدا و کاریگەری جێهێشتن لەسەر پرۆسە سیاسیەکان توانیویەتی بەشێوەیەکی پراگماتی و تەکنیکێکی زانستیانە و تەکنەلۆژیایەکی مۆدێرن پەراوەی بەکارهێنانی سەرجەم خێر و شەڕەکانی ناو ئەو کلتورانە بکات لە پێناو قازانجەکانیاندا، حزبە سیاسیەکانی لای ئێمەیەش بەشێکن لەو واقعە. ڕۆشنبیرەکان بەشداری سیاسی و کاریگەری سیاسی خۆیانیان بە نا

ڕاستەوخۆیی قبووڵکردوە لەسەر ئاستی ڕووکارەکان خۆ گەر زۆر بوێر بوو بن کەمێك لەسەر ئاستی فشار و پەراوەکردنی فشار پەراوەیان کردووە.

(٨)

تا ئێستاش هیچ مانایەك نەبەخشراوە بەدیموکراسیەت لەسەر ئاستی پێویستیەکی لۆکاڵی و پەراوەکردنی ئازادی لە کوردستاندا کە زادە و دەرهاویشتەی کۆمەڵی کوردستان بێت یان ستراتیژێکی سیاسی بۆ واقعی عێراق دابرێژێتەوە. ڕاستە ئەو ستراتیژ و دارشتنەوانە ئەرکی سەرشانی هێزە سیاسیەکانە بەڵام هێزە سیاسیەکان ناچارن تێگەیشتنیان بۆ ئەو ڕاستیانە لەسەر بنەمایەکی تیۆری دەرەکی بێت کاتێك ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدارەکانی ئەم وڵاتە تەنها پەراوەی سیاسی حزبیانە ڕەت دەکەنەوە و بۆ خۆیان پێیان ڕەوا نیە وەك سیاسەتمەدارێکی بێلایەنیش کاربکەن لە ناو واقعی کوردستاندا، جا ئەمە هۆکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی تەنها باوەڕیان وایە دەبێت سیاسەت لە چوارچێوەی حیزبەکاندا بکرێت، باوەڕیان وایە سیاسەت مەترسی دارەو کارە ڕۆشنبیریەکان ئاسانترن و دەتوانن لە ڕێگەی ڕەخنەگوزاریەوە ئەو ئەرکە ببینن یان باوەڕیان وایە سیاسەت کاری ئەوان نیەو تەنها دەکرێت لە گەمە سیاسیەکاندا بەکاربرێن.

گەربێینە سەر ئەو دیموکراسیەتەی ئەمڕۆ لە پانتاییە جیاجیاکانی دونیادا پەراوەدەکرێت ناچارین پیاچوونەوەیەکی واقعیانە بۆ هۆکارەکان و مەترسیەکانی ئەم سیستەمە بیر لێبکەینەوە پێش ئەوەی جەنگەکانی داهاتوو ڕوو بدەن، لە ڕاستیدا ئەو جەنگانە بەتەنها هەناردەی قەیرانەکانی ڕۆژئاوا نین بۆ ڕۆژهەڵات ئەوەندەی جووتەکی نێوان دوو سیستەمی جیاوازی دوو کلتورە،

که یەکێکیان لە خوودی خۆیدا ماسۆشیەتی پەراوەی دەسەڵاتی دیموکراسیانەی سەردەمی پێقبووڵە بۆ تاك لە ڕۆژئاوادا و ئەویتریان لە چوارچێوەی ڕەهەندە نا ئازادەکانی خۆیدا تەنها ڕووە گەشە بریقەدارەکەی دوونیای سەرمایەداری پێ ڕەوایە گەر لەسەر حسابی ئازادیەکی بێ جەوهەریشدا بێت بە ناوی دیموکراسیەتەوە. ئەمەشم پێ سەیر نیە کاتێك ژینگەی پەروەردەیی هەمەچەشنی دانیشتوان لەسەر بنەما فەلسەفیەکانی چەواشەکردن بەڕێوە بچێت.

گەر سیستەمی دیموکراسی کە لە دونیادا بانگەشەی بۆ دەکرێت ڕێگە بە خۆی بدات، ئەوا زۆر دەمێکە کاتی ئەوە هاتووە پیاچوونەوەو خوێندنەوەیەکی تایبەت هەبێت بەرامبەر خودی دیموکراسیەت کە وەرچەرخاوەتە سەر دیکتاتۆریەتێکی پەنهانانەی سەرمایە و هێزی بەهێز. لە هەموو ئەو فۆرمانەی دیموکراسیەتدا کاتێك پێناسە و بانگەشەی بۆ دەکرێت، گەل سەروەرەو و بەشداری بڕیاری سیاسی دەکات، بەڵام بابێینە ناوەڕۆك و ڕاستێتی بڕیاری گەل، ناکرێت لێرەدا باس لە پێکهاتەی سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی گەل بکەین وەك گرۆپەکی گەورە، باشتر وایە ڕووکار و ئاکاری دیموکراسیەت باس بکەین لە باشترین فۆرم یان پرانسیپی پرۆسە سیاسیەکە خۆیدا.

دیموکراسیەت سیستەمێکی ژیانە کە حوکمی گەل دەکات، لە ژێر سایەی ئەم سیستەمەدا گەل بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگای نوێنەرە هەڵبژێراوەکانەوە پیادەی دەسەڵات و سەروەری خۆی دەکات.

بەم جۆرەش واپێناسەدەکرێت، گەر دەوڵەتێکی دیموکراتی توانی دەزگاکانی ڕادەربڕین ئازاد بکات، یەکسانی دەرفەت و هەستی تەبایی بەرجەستە بکات ئەوا لە ڕووی دیموکراسیانەوە قبووڵە. کەواتە ئازادی سیاسی پێویستیەکی هەنووکەیی و هەمیشەیی دیموکراسیەتە.

تاکە ڕووکاری پۆزەتیڤی دیموکراسیانەی ئەم قۆناغە سیاسیەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە ئازادی ڕادا بەدی دەکەم، کە ئەوەش کەوتووەتە ژێر گوشاری فاکتەرە جۆراوجۆرەکانی بەرژەوەندیەوە لە ڕووی عەمەلیەوە، بەبەردەوامی مەترسی هەیە لەسەر دەستەبەرکردنی ئەو ئازادیەی ڕا، گەر پەراوەی سیاسی وەك بێ لایەنی حیزبی لە دەرەوەی دەسەڵاتە سیاسیەکانەوە نەبێتە ئەرکی ڕۆشنبیر. هەر لە چاکە و خراپەی کلتورەکانەوە دیموکراسیەتیش کەرەستەیەکی بێخەوشی پاکژکردنەوە نیە بەرەو هیومانیستی بوونی کۆمەڵگا و مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵگایانە. بەپێویستی دەزانم باس لە ڕووکاری بریقەدار و ڕووکاری تراژیدی دیموکراسیزم بکەم بە هەر تەرزێك پەراوەدەکرێت و هەرمیکانیزمێکی بە عەمەلیکردنی هەبێت.

ڕووکارە بریقەدارەکان: لە ڕاستیدا گەل لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە دەسەڵات هەڵدەبژێرێت و ئەو دەسەڵاتەش کاتیە و بە پێی یاسا پارێزگاری لە گەل دەکات و حوکمیان دەبات بەڕێوە. کە ئەمەش بۆ گرۆ دیموکراتیزەکراوە جیاجیا قەوارە بچوکترەکانیش ڕاستە. گەل بەم جۆرە خۆی بڕیار دەدات و لە ناو خۆیدا حوکمڕان و دەسەڵاتی بڕیار هەڵدەبژێرێت. ئەمەش سیستەمێکی قەشەنگەو بێگردتر لەمە لە دونیادا پەیدا نابێت، بەڵگەش بۆ ئەم مەبەستە، گەل گەلێکی ئازادە لە ڕا دەربڕیندا بەپێی یاسایەك، تاکەکانی گەل ئازادن چ کارێك و چۆن

کارێك بکەن بە پێی یاساکانی کارکردن، ئازادن لە پەیوەندیەکانیاندا بە پێی یاسایەك هەروەها لە ڕووی سیاسیەوە ئازادن چ جورە پارتێکی یاسایی هەڵبژێرن یان سەر بە چ قوتابخانەیەکی فکری بن. لە پاڵ ئەمانەدا ئاستەنگ نیە گەر تاك نەتوانێت هەڵبژاردن بکات لە ناو ئەو هەمەڕەنگیەی باخچە دیموکراسیەکاندا. تاك دەتوانێت هەوڵ بدات تا باشترین هەڵبژاردن ئەنجام دەدات کە لە گەڵ خواستی ئەودا یەك دەگرێتەوە، لە ڕاستی دا ئازادە بۆ خۆ قاڵکردنەوە و پسپۆڕبوون بۆیە ئاستەنگ نیە کاتێکیش دێتە سەر ئەزموون یان پێوانەی ڕا جۆراو جۆرەکان، ئەوا پێوانەی بێخەوش هەیە و کە ئەوانیش لە چوارچێوەی هەڵبژاردن دا ڕێکدەخرێن.

سەرەتا هەمووان ئازادن بۆ خۆ پاڵاوتن لەسەر ئاستە جیاجیاکان، پاشان ئەوەندە فۆرم و جۆری جیاواز پاڵێوراون جیاوازی ڕای تاکەکەس لە گەڵ سەرجەم فۆرمەکاندا نزیك دەبنەوە لە نەمان. لە قوژبنێکی تری هەڵبژاردندا زۆر ئازادانە دەتوانیت هەڵبژێریت، یەکسانیەکی بێ هاوتا هەیە و هیچ جیاوازی نیە لە نێوان کارتەکانی دەنگدانی ئەحمەد و مەحمودا. پێوانەش زۆرینەی دەنگە کە شەرمی لە کەس نیە، لێرەوە دونیا چەند بێگەردە چەند یەکسانیخوازە.

دواجار کە ئەنجامەکان دەرکەوتن، گروپ و کەسایەتی سەرکردە لە لایەن گەلەوە هەڵبژێردرا، دەسەڵاتیان دەدرێتە دەست و پاشان بەپێی دەستور و یاسایەك کە هەمووان یەکسانن لە بەرامبەریدا، وەڵامی داخوازیەکانی زۆرینە دەدەنەوە و حوکمی هەمووان دەکەن. پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی یاساییش جارێکیتر پرۆسەکان چەند بارە دەکرێنەوە. بەم پێیە کۆمەڵگا بەشێوازێکی

ئاشتیانە بەرەوپێش دەچێت، ئەوەی نەفرەتیش لەم سیستەمە دەکات تۆقێنەرەو کەسێکی نەفرەت لێکراوە.

رووکارە تراژیدیەکە: ئەم رووکارە، رووکاری عەمەلیە و بەرەی هیومانیستەکان لە مێژوودا تەنها تیۆریزەکردنەکەیان کەوتە ئەستۆ، لە راستیدا جیاوازیەکی ئەوتۆی نیە لە گەڵ سیستەمە دیکتاتۆریە تاک رەهەندەکاندا. لێرەدا تەنها بەوە جیادەکرێتەوە کە دژی دیکتاتۆریەتە بەڵام نەك هەر چارەسەری نایەکسانی و چەوساندنەوەی نێوان مرۆڤەکان بۆیەکدی ناکت، بەڵکو لە کەناڵە ئاوەڵاکانی ئازادیدا رای ئازادانەی خەڵك دەخەسێنێت.

گەل لە رووی چۆن و چەندەوە بە دوو هاوکێشە پێناسە دەکرێت کە لە پەراوە دیموکراسیەکاندا تەنها تای تەرازووی چەند مامەڵەی پێ دەکرێت، گەل پێکدێت لە زۆرینە و کەمینە، گەل پێکدێت لە هەڵبژاردەکان (نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ)، بەهێزەکان و نۆرماڵەکان. لە رووی سیاسیەوە لە چەند و چۆندا گەل لە پرۆسەی هەڵبژاردن و خەونەکان و گێلکردنەکانی هەڵبژاردندا بە زۆرینە بڕیار دەدات کە هیچ پەیوەست نیە بە چۆنێتی بڕیارەوە. ئەم زۆرینەیە زۆر گێلانە بڕیاری سیاسی ناڕاستەوخۆ دەدەن بۆ پاراستنی دەسەڵات و گوێزرانەوەی سەروەری بۆ بەهێزەکان، کە راشکاوانە دەڵێین خاوەن بەرژەوەندیە بەهێزەکانن.

بەشێوەیەکی واقعی بەهێزە بەرژەوەندی دارەکان دەبنە خاوەن دەسەڵات، ئەگەرچی هەندێ کات لە شێوەی دەسەڵاتدان و هەندێ کاتیش تەنها بڕبڕەی پشتی دەسەڵاتن. واتە لە رووی فۆرماڵیتیەوە یان ئاکارەوە دەسەڵات نین. ئەم

دەسەڵاتە بڕیاری قەدەغەکردنی شۆڕش و سەرکوتکردنی هەڵبژاردە نەیارەکان دەدات بەپێی یاسای ژمارە (س) هەمان یاسا ئازادی بۆ لاوازەکان دەڕەخسێنێت تا بەربەرەکانی بکەن، بەڵام بەربەرەکانی لاوازەکان دەبێت چ توانایەکی هەبێت و لە چ ئاستێکی بەربەرەکانیدا بێت. هەروەها نۆرماڵەکانیش ئازاد دەکات بەتەواوی. دیارە ئەمانە قۆناغی خۆی هەیە کە پێناسەی تاك لە ناو گرۆدا بکات و ساغی بکاتەوە نۆرماڵە یان هەڵبژاردەیەکی نەیار بە دەسەڵات، خۆ ڕاستریشە بڵێنن ناکۆکە لەگەڵ تیژە عەمەلی و/یان ستراتیژیەکانی دەسەڵاتدا.

ئاکامەکان، ژیانی ئاسایی چێژی نامێنێت، بەڵام وەك ئازارێکی هێواشە و بەرەبەرە بەرەو مەرگ ڕاپێچی بێدەرفەتەکان دەکات. ئەو ئازارە توندوتیژەنیە کە لە سیستەمە دیکتاتۆریەکاندا بەرجەستە دەکرێت بەزەقی و لەبری جەستەکان نەستەکان و گیرفانەکان ئازار دەبینن، ژیان مانایەکی نامێنێت.

ژیانی سیاسی بەپێی یاسەك ئازادە بەپێی دەیان یاساش قەدەغەیە، ئایا دیموکراسیەت وەك سیستەم ڕێگا بە خۆی دەدات بیرێکی سیاسی ڕادیکاڵ ئازاد بکات و پەراوەی سیاسی خۆی بکات بۆ کۆکردنەوەی خەڵك لە دەوری دیاردەیەك، بەم بەڵگانە تەنانەت چاکسازیش دەبێت لەگەڵ بەرژەوەندی تەوژمی بەهێزدا یەك بێتەوە، دەنا بە ڕەوتێکی نا ڕەوا لە قەڵەم دەدرێت. با کەمێك سادەتر بیر بکەینەوە، کاتێك بڕیارێکی کۆ خۆکوژی لە ئارادا بێت، وەزۆرینە پەسەندی بکەن ئەوا بڕیارێکی یاساییە. بۆیە کاتێك گەر بەرژەوەندی بەهێزەکان لە ڕووی کرداریەوە ببێتە ستراتیژەکانی حوکمڕانی ئەوا زۆر بەسانای دەتوانین بڵێین کە دیموکراسیەت حوکمی نەفامەکانی کۆمەڵگایە جا

ئەگەر زۆرینەش بن. ئەمش داکۆکی کردن نیە لە' حوکمی دیکتاتۆریانە ئەوەندەی کە دەتوانین بلێین نەسیستەمی شورایی ئیسلامەکان و نە شێوازی ئەمریکیانە بۆ دیموکراسیەتی سەرمایە ئەو چارەسەرسازە سیحریەیە بۆ کۆمەلگای ئێمە، لە کاتێکدا بەسترانەوەی سیاسی کوردستانی عێراق بە عێراقەوە واقعێکی سیاسی و کۆمەلایەتی تالّی ئەمرۆیە، ئەمە لە لایەك و مەترسیەکانی نەبوونی پێناسەیەکی واقعی کوردەکانی عێراق بۆ ئەو دیموکراسیەتەی خوازیارن لە داهاتووی عێراقدا لە لایەکیترەوە نا ئاشکرایی و نا ئامادەیی هزرمەندەکان پیشان دەدات لە بەرامبەر سیستەمە سیاسیەکاندا.

گەر بیر لەرۆلّی سیاسی رۆشنبیرەکان بکەینەوە لە سەردەمی نەفی کردنی حیزبەکاندا تەنها لە چوارچێوەی سیاسەتمەداری بێلایەندا دەتوانرێت پێناسەبکرێت کە ئەمەش ئەرك و ماندوو بوونێکی زیاتری لە رەخنەگرتن دەوێت، دەنا گەر هاوبەشی سیاسیانەی ئەو گرۆ و دەستە هەلّبژاردانە لە چوارچێوەی ئەدەبیاتێکی بەکارهێنراوی (ئیستهلاکی) سەردەمی گلۆبەلایزەیشندا سەیر بکەین بێگومان ئەوانە دەبنە پاشکۆی دیاردەسیاسیەکانی سەردەم و دەکەونە پەراوێزی مێژووەوە لەبری کاراکتەرایزەکردنێکی کریەتیف و ئاکتیڤ دەبنە کاراکتەرێکی پاسیڤی جەستە کۆمەلایەتیەکان.

(٩)

لە هەموو ئەو تیۆری و سیستەمە سیاسیانەدا، سیاسەتمەداری بێلایەن کاریگەری خۆی هەبووە ئەگەرچی لەسێبەری سیستەمە پێناسەکراوەکانیشدا

کاریانکردبێت یان پارێزرابن، کەئەوەش بۆ خۆی نهێنی دیاردەی جەور و ستەمە لە سەردەمە جیاجیاکاندا.

سیاسەت ئەو کەرەستە کۆمەڵایەتیەیە کە بەهۆیەوە دەتوانرێت کاروباری گشتی کۆمەڵ ڕێکبخرێت، ئالێرەوە سیاسەتمەدار ناوی بکەرە، واتە ئەوکەسەی کاروباری کۆمەڵگا ڕێکدەخات یان لە کاروباری کۆمەڵگا دەکۆڵێتەوە. ئەو کۆمەڵگایە لە چوارچێوەی پێکهاتەیەکی دیاریکراودابێت وەك دەوڵەت، ئەمارەت، هەرێم یان هەر پێناسەیەکیتری کۆن و نوێی هەبێت.

زۆربەی پێناسەکان کاتێك پێناسەی سیاسەت دەکەن وەك هاوبەشیکردن لە کاروباری دەوڵەت یان چالاکییەکانی دەرەوە و ناوەوەی دەوڵت پێناسەی دەکەن، دواجاریش بە بەڕێوەبردنی کارگێڕی وڵات ناودەبرێت.

ئەو پارسەنگەی لایەندار و بێلایەن بەلایەکدا دەخات، ئازادیە، ئازادی هەڵبژاردن، ئازادی بیروڕا، ئازادی بڕیاردان. هەموو ئەگەرەکان ئاوەڵان، بەڵام تا چ ڕادەیەك تاك ، مرۆڤ ، ئازادە چ ئەگەرێك هەڵبژێرێت یان پێی هەڵدەبژێردرێت؟ کاتێك مرۆڤ دێتە سەر هەڵبژاردن ئەوا بیر لە لەدەستدانی بەشێك لە ئازادیەکانی دەکاتەوە، گەرچی ئازادانەش بڕیاری هەڵبژاردنەکەی بدات.. هەمیشە مرۆڤ بیردەکاتەوە لە پەیوەندیەکان، مرۆڤی سیاسی، سیاسەتمەدار، بەدەر نیە لەو بیرکردنەوانە ئەگەر زیاتر لە مرۆڤی ناسیاسیش بیرنەکاتەوە، مەبەست ئەو کەسانەیە کە بە پیشە سیاسەت ناکەن. کاتێك مرۆڤ بیریکردەوە لە ساتە وەختی بیرکردنەوەکەیەوە ئازادی بیروباوەڕەکانی خۆی سنووردار دەکات، (بەتێپەڕبوونی کات و هەڵبژاردنی بەردەوام بیروڕاکان

جێگیر دەبن پاشان خاڵەکانی وەرچەرخانی بیروباوەڕ بەرەو پیربوون و لاوازی و دواتر بەرەو مردن دەڕۆن ئەگەر بەردەوام لە پیاچونەوەیەکی زانیاری و قەوارە دۆگماکان خۆی دەرباز نەکات).

مرۆڤ بە شێوازی جیاجیا لە قەبارە کۆبووەوەکاندا کاری سیاسی خۆی دەکات، کاتێکیش دەبێتە پیشەگەر لە بواری سیاسیدا ئەو قەبارانە دەبنە ژینگەی دەستوری بۆ ژیانی کارکردنی سیاسی. ئەو قەبارانە بۆ خۆیان و کارکردنیان چەند ناوێکیان بەخۆیان ڕەوابینیوە وەك گرۆی سیاسی، ئایدۆلۆژیای سیاسی، پارتی سیاسی و بزوتنەوەی سیاسی.

ئەو مرۆڤانەی ئەنجامی بیرکردنەوەکانیان بڕیاری هەڵبژاردن دەدەن بۆ کارکردن لەکاروباری کۆمەڵدا بەشێوازێکی سیاسی، گومانی تیادانیە کە لە ڕووی فەلسەفی و بیری سیاسیانەوە لایەنداری بیرێکی ئازادانەی خۆیان دەکەن، بەڵام لە ڕووی فۆرماڵیەوە لە گەڵ هیچ ئۆرگانێکی سیاسیدا تەبا نابن تا ئەو ئاستەی ببنە بەشێك لەو ئۆرگانە، ئەمەش بۆ خودی خۆی نەبوونی لایەنداری ئۆرگانیکی سیاسی درووست دەکات. ئەم خاڵەش ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها کارکردنی سیاسی کارا، دەبێت لە چوارچێوەی ناو و پێناسە ئۆرگانیککراوەکاندا چالاکیە سیاسیەکانی بەئەنجام بگەیەنێت. چونکە تاك، بچوکترین یەکەی کۆمەڵگا، خوازیاری گۆڕینەکانەو ئەڵتەرنەتیڤی زانستیش بەتەنها بە ئۆرگانە زەبەلاح و گرمۆڵەبووەکانەوە نەبەستراوەتەوە، بەتایبەت ئەوانەی بەڕووی ئایدۆلۆژیا و بەرژەوەندیەکانیاندا داخراون.

نەبوونی سیاسەتمەداری بێلایەن سەلماندنێکی پڕاوپڕی نەبوونی ئازادی سیاسیە، بە درێژایی مێژوو سیاسەتمەداری ئازاد و بێلایەن لە هەموو سەردەمەکاندا کاریانکردووە و شوێنکەوتیان دیار بووە، گەرچی زۆر چالاك و کاریگەریش نەبووبن.

بابەت بەشێوەیەکی سەرەکی خوازیارە بچینە سەر باسی بێلایەنی سیاسی و کۆمەڵی ئێمە. لە کۆمەڵگای ئێمەدا لایەنداری سیاسی چی شتێك جیاواز ناکات لە لایەنداری بۆ پارتێکی سیاسی ((لایەنداری حزبی)).. لە کۆمەڵگاکەماندا و لە بواری سیاسەتدا بەشێوەیەکی پیشەگەری سیاسەتی بێلایەن نەبووە، گەر هەولێکیش هەبووبێت لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە ئەکادیمیەکانەدا کاری کردوە، یان ڕۆشنبیرەکانی بوارە ئەدەبیەکان زۆر بەترس و دوودڵیەوە بەشێوەیەکی غەریزی بەشداری سیاسیانەیان کردووە. ئەمەش لە بواری کرداریدا بەرجەستە نەکراوە، کاتێکیش کە پەراوەی سیاسیانەی بێلایەن پیشەگەرانە نەبووبێت، ئەوا چالاکانە لە بواری گۆڕینی کۆمەڵگادا جێدەستی دەرنەکەوتووە و ناکەوێت.

پارتی سیاسی لە مێژوودا ئەنجامی زنجیرەیەك چالاکی مرۆیی درووست بووە، هەر یەکێك لە پارتە سیاسیەکانیش لە دونیادا خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆیان هەیە. لە ڕووی سیاسیەوە ناکرێت بە شێوەیەکی زانستی پێناسەی پارتی سیاسی بکەین.. ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی واقعی کەلەو هۆکارانە، هۆکاری ناوەکی ناو پارتە سیاسیەکانە: پارتە سیاسیەکان لە لایەن کۆمەڵێك خەڵکی دیاریکراوەوە بەڕێوە دەچن و سەرکردایەتی دەکرێن کە جیاوازن لە پارتێکی تر و هەرگیز دووانێك لەو پارتانە نیە کە لە یەکتر بچن. ئەم جیاوازیە خەسڵەتی جیاواز بە پارتەکان دەبەخشێت بۆیە گەر لێکۆڵینەوەی

زانستی بکەین پێویست دەکات لەسەر پارتێکی دیاریکراو لێکۆڵینەوە بکەین کە دواتر بۆ پارتێکی سیاسیتر بەکار نایەت و ئەو جۆرە لێکۆڵینەوەیەش زیاتر دەچێتە خانەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانەوە نەك شیکاری و جێبەجێکاریە سیاسیە زانستیەکان.

هەروەها هۆکاری دەرەکی لەسەر چەند بابەتێك دابەش دەکرێت لە گرنگترینیان، ژینگەی مێژوویی، ژینگە و زەمینەی کاری پارتە سیاسیەکان هەمیشە لە گۆڕاندایە و پابەندە بە هۆکارە سیاسیەکانی چواردەورەوە. نمونەیەکیتر لەو بارەیەوە پارێزگاری نهێنیەکانی ناو پارتە سیاسیەکان، کەسێتیە سەرکردەکان ناتوانن باس و لێدوان لەسەر وردەکاریەکانی پارتەکانیان پێشکەش بکەن و ڕاستیەکان ئاشکرا بکەن لە کاتی گونجاودا. چونکە لە لایەك بەشدارن لە ئیمپاکتە نێگەتیڤەکان و لە لای دووەمەوە مەترسی ئامێزە.

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت بەرامبەر پارتە سیاسیەکان، لە هەموو سەردەمێکدا ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ ڕۆڵی سیاسەتمەداری بێلایەن بە ئاسانی زەقدەبێتەوە. لەسەردەمی ئیغریقیەکاندا، کەبەسەرەتای ژیانی شار یان شارنشینی دادەنرێت لە لای زووربەی مێژوونوسەکان، مرۆڤ تیایدا پێش هەموو شتێك هەستی کردووە کە هاوڵاتیە و کاروباری شارەکەی پەیوەندیدارە بە بوونیەوە. گەرچی دواتر ئەم دیاردەیە وردە وردە لە ناوەڕاستی سەددەی نۆزدەوە بە پێکهاتنی پارتە سیاسیەکان شکایەوە، بەڵام سەرەڕای سەروەری پارتەکانیش ڕۆڵی سیاسەتمەداری بێلایەن ون نەبووە.

لەم سەردەمەدا کە دونیا ڕوو لە پەرتبوونێك دەکات و ئاکامەکانی ئەو پەرتبوونەش یەکانگیریەکە لە دووتوێیەکی سیاسی ئابووریدا و چیتر زانیاری ناشارێتەوە، مرۆڤیش پێش هەمووشتێك دەخوازێت هەست بە مرۆڤایەتی خۆی بکات. بۆیە بەدەر لە پارتە سیاسیەکان ژیانی سیاسی کۆمەڵ پەیوەندیدارە بە هەر تاکێکەوە و بەتاییەت ڕۆشنبیرەکان و ناکرێت چالاکی سیاسی لە بۆتەی گرۆیەندی و پارتچێتیدا بەندبکرێت. ئالێرەوەیە مرۆڤ سیاسەت وەك پیشە هەڵدەبژێرێت کە کاڵایەکی کۆمەڵایەتیە، مەرج نیە لە چوارچێوەبەندەکاندا کارو چالاکی سیاسی پەراوەبکات کە دەزانێت هەڵبژاردنی چوارچێوەیەکی سیاسی ئازادیەکانی لێداگیر دەکات، کە ئەوەش بە گشتی ئازادی نیە، گەرچی ڕێگریش نەبێت لە ئازادی.

وەك لەسەرەتاوە باسمانکرد سیاسەت کەرەستەیەکی کۆمەڵایەتیە بۆ چاککردنی باری ژیانی مرۆڤ، نەك چالاکیەکی دەسەلاتگەری بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات. ئەرکێکی سیاسەتمەداری بێلایەن هەمیشە کارکردنە بۆ چاککردنی باری ژیانی مرۆڤ لە ڕووی سیاسیەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەمیشە چەمکی بێلایەنی سیاسی ئەوڕەوتەیە کە دەتوانێت ڕێ بە دەسەڵات بگرێت لە شێواندنی ئەرکی مرۆڤانەی کاری سیاسیدا، لە کاتێکدا ئێمە باس لەم ڕاستیانە دەکەین هەمیشە دەسەلات لە کوردستاندا لەماوەی دەساڵی ڕابردوودا نەرمی پیشان داوە بۆ ئەو تاکە چالاکانەی خوازیاری بەشداری سیاسی بوون بەشێوەیەکی بێلایەن نەك بەتەنها لەسەر کورسیەکانی دەسەلات بەڵکو لەسەر کورسیە گرنگەکانی پشت دەسەلاتیشەوە، بەلام زۆر بەکەمی کەسێتی خاوەن ستراتیژ و کاراکتەر ئەکتیف نامۆ بوونی خۆیان بە دەسەلات و بەسیاسەت

سەلماندووە، ڕاستە ئەگەر ئەو هەوڵەی دەسەڵاتی سیاسی کوردستان بەشێوەیەکی ڕووکەشیش بووبێت بەڵام نەبوونی تەکنیشنی سیاسی و خەڵکی ڕۆشنبیری سیاسی پیشەگەر خۆیان پێناسە نەکردووە بە تەواوی تا بتوانن بەشداریەك بکەن لە قەدەر بارودۆخ و زەمینەی سیاسی ئەم وڵاتەدا. کاتێکیش دێتە سەر ڕەخنە داپلۆسێنەرەکان بۆ واقعی سیاسی کوردستان لە بەرەی پێشەوەی جەنگاوەرەکاندا ڕۆڵیان بینیوە، نازانم ئەمەیان ناو بنێم چی، ئایا لاهوتیەتی ڕۆشنبیری نوێی دژ بە دەسەڵاتە یان دەسەڵاتی خۆبەپیرۆز زانینە کە مرۆڤی خۆ بەڕۆشنبیر زان نایەوێت لە ئاستی عەقڵانیەتی دەسەڵاتدا کەمێك لە یۆتۆبیاکانی خۆی دەرباز بێت و ئەو ڕۆڵە ببینێت.

لە کاتێکدا ڕاگەیاندن پەرەی سەندبێت و یەکێك بێت لە تەوەرەکانی دەسەڵات، لە کاتێکدا تێکشکانی سنووری زانین بۆ نهێنیەکان دیاردەی سەردەم بێت، ئەوا بوار لەبارترە تا سیاسەتمەداری بێلایەن کاریگەرانە تر ڕۆڵی پۆزەتیف ببینێت لەسەر شانۆی سیاسی.

گەرچی ململانێی نا ئاشتیانە تا ئێستاش لە دونیادا و لە زۆرشوێنی جیهاندا ڕۆڵی خۆی دەبینێت، بەڵام سەرجەم کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ڕوو لە ئاشتیەکی هێمنانەی پڕ جەنگێکیتر دەکات، بە تایبەت گرۆ لاوازەکان لە ڕووی تەکنەلۆژیا و هێزەوە ناتوانن بە ڕێگای نا ئاشتیانە بگەنە ئامانجەکانیان، هەر لێرەشدا خەونی ڕادیکاڵیزمی بیروباوەڕەکان پوچەڵدەبێتەوە، چونکە ناتوانن لە هاوکێشەی بیروباوەڕ و تەکنەلۆژیادا براوەبن. بۆیە بە ناچاری تاکە ڕێگا بۆ ململانێ ڕێگاچارەی ئاشتیانەی کاری سیاسیە، هەرچەندە ئەوەش وەك ستراتیژ لە سێکوچکەی هێز، دەسەڵات و دانوستاندندا شوێنی لەرزوکە، بەڵام کاتێك

ڕێکاچارەی ئاشتیانە ببێتە کەلتور بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە ژێر فشاری تەکنۆلۆژیا و فاکتەرە ئابوورییەکاندا، ئەوا سیاسەتمەداری بێلایەن بواری فراوانتری دەبێت بۆ ڕۆڵبینین لەسەر پانتاییەکانی کارکردن و بەهێزکردن و بەتواناکردنی گرۆ لاوازە پەراوێز کراوەکان.

لەکاتێکدا شیکردنەوەی سایکۆلۆژی بۆ لایەنداری دەگەڕێتەوە بۆ بێهێزی مرۆڤ، کە لە بۆتەی گرۆدا هەست بە ئاسایشدەکات، بەو پێیە مرۆڤ ئازاد نابێت. ئەم تیوریانە سەردەمانێکی سیاسی ئابووری تەکنۆلۆژی و کلتوریان بەسەردا تێپەڕیوە، جیهان هەنگاو دەنێت بەرەو دڵنیاکردنێکی کاتی و ترسێکی درێژخایەن، بۆیە ئەم تیۆریانە پێویستیان بە پیاداچوونەوە هەیە. بەرەو پێشچوونی کۆمەڵ بۆ خۆی ڕوو لە نەمانی ئەو پێویستیە دەکات بۆ ئەو یەکانگیریە بەهێزە لەسەر ئاستی گرۆی بچوك، کە چیتر گرۆ نەتوانێت ئاسایشی تاکەکانی بپارێزێت گەر گرۆەکانی تر نەخاتە ژێر گوشارەوە.. ئەمڕۆ لە جیهاندا هەوڵەکان بۆ جێگۆڕکێیە کە لە نێوان سیاسەت و ڕۆشنبیریدایە کە لە خودی خۆیدا ئاکام و دەرئەنجامی نادرووستی سیاسەتەکانی دەسەڵات و هەوڵە سیاسیەکانە بۆ دەسەڵاتگرتنە دەست، خۆ ئەگەر دەرفەتیش بۆ لایەنە سیاسیە بەرژەوەندی دارەکان خۆش بکرێت، ئەوا زۆر بە ئاسانی لەو هاوکێشەو جوغزە سیاسیە ئابووریانەدا کاردەکەن کە بۆی هەیە لە بچوکترین بەدحاڵی بووندا گەورەترین جەنگ لە دژی یەکدی بەرپابکەن و سەرجەم باجەکانیشی گرۆ لاوازەکان دەیدەن.

لە سەددەی ڕابردوودا سیاسەتە دەسەڵاتگەری ئامێزەکان هیچ ئاکامێکی باشیان بە کۆی مرۆڤایەتی نەگەیاند. ئەوەش بەرهەمی دوو جەنگی جیهانی

گەورە و دەرهاویشتەکانی بوو پاشانیش جەنگی جیهانی سارد. لە هاوکێشەی هێز و دەسەڵاتدا سیاسەتمەداری بێلایەن تەنها بلۆکەی سەر ئاو ماوەتەوە، بۆیە لەو جۆرە کەسێتیانە هەمیشە روویان لە گرۆبەندی و کاری پارتیگەری کردوە لە سەددەی ڕابردوودا. بەڵام ئێستا هاوکێشەکانی هێز، لە سەر ئاستە ناوخۆییەکان زۆر گرگنە بوونەتەوە، لەسەر ئاستە جیهانیەکانیش زەبەلاح بوونەتەوە، بەرەو ململانێی گەورە پیاوانی بازاڕی ئابووری ئازاد، کەئەمەش فەزایەکی زۆر دوورە لە بەردەم تاکەکاندا بۆ کارکردنی کاریگەر و بگۆڕ لە شێوەی گرۆدا.

هەنگاو نان بۆ بانگەشەی بەرەو دیموکراسیەت بووەتە هۆی بەرزکردنەوەی ژمارەی پارتە سیاسیەکان و کەمکردنەوەی ڕێژەی ئەندامانی پارتەکان لەسەر ئاستی جیهانی و پەرەوازەبوونی زۆریتر کە تاڕادەیەك ئەوانەی ئیتمایشیان بۆ پارتەکان هەیە زۆر بەشێوەیەکی بەکاربراو چالاکیەکانیان بێ ئاکام و نا کاریگەرە، تەنها و تەنها هاوکێشەی توند ڕەوی ئایدۆلۆژی و هاوکێشەی بەرژەوەندی تاکە کەسی کاریگەرانە سەودا و مامەڵەی سەرکەوتوانەی کاتی خۆی دەکات، ئەمەش لە مەودا درێژ خایەنەکاندا لە دژی بەرژەوەندی زۆرینە دەشکێتەوە. چونکە دیاردەی بەربەرەکانیە دایەلۆگییەکان و ڕا گشتیە کارتێکراوەکان، بە تەوژمی ڕاگەیاندنی، لەو پانتاییەدا چالاکی ئابووری ئازادی ڕەخساندووە. ئەمەش نەك هەر بەتەنها ئەرکی سەرشانی سیستەمی دیمەکراسیە بگرە ڕچەڵکی فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای سەرمایەداری لیبرالیشە.

لەم نێوەندەدا سیاسەتمەداری بێلایەن ئەرك و خەمی لابردنی چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤی دەکەونە ئەستۆ و دەتوانێت بەرەنگاری بلۆکەکانی برژەوەندی

ببێتەوە. ڕاستە لەوانەیە نەتوانێت بە ئامانج بگات، بەڵام دەبێتە دیفاکتۆیەکی کلتوری بۆ مرۆڤایەتی گەر کارکردنێکی سیستەماتیك و زانستی هەبێت بۆ پێشهاتە تەکنەلۆژیەکان و کاریگەری لەسەر کلتورە جیاجیاکان جێبهێڵێت. ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە بلۆکەکانی بەرژەوەنی هەمیشە بواری بەتەنهای دەسەڵات و سەروەریان بۆ نارەخسێت کە سەرجەمی دەستکەوتەکان بە تەنها بۆ ئەوان بێت، جا لە هەرشێوەیکدا بن (خێڵ، گەل، پارت، کۆمپانیا...هتد).

بۆیە بە ناچاری گەورەییەکەیان پابەندە بە خەڵکەوە و سێبەری ئەو گەورەییەش لاوازەکان دەتوانن بیقۆزنەوە، کە کار ئاسانی سیاسەتمەداری بێلایەن لەو بوارەدا گرنگە، لایەنی کەم تا وەرچەرخانێکی ئابووری وتەکنۆلۆژی یان کۆمەڵایەتیتر.

لەو ڕوانگەیەوە ئەرکەرکانی گۆڕین دەکەوێتە سەر دەستە هەڵبژاردە بێلایەنەکانی بۆاری سیاسەت. کە بەناچاری دەبێت وەك سەربازی گومناو لەو بوارەدا هاوکێشەی بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی خود ڕابگرن لە پێناو ئامانجە جیاجیاکانیاندا کە لە کۆتاییدا لەسەر خاڵە گشتییەکان پێویستە کۆکبن بۆ هەبوونی ستراتیژێك و کارنامەیەکی نا فۆرماڵی.

هەمە چەمکەکان و شێوازەکانی لایەنداری سیاسی لە دەوری بازنەی بەرژەوەندی کۆدەبێتەوە، جگە لە بازنە سەرەکێشەکان، کە لە زۆرینەی بارەکاندا سەرەکییە. هەمیشە لایەنەکان کامەرانی گشتی بە خۆیانەوە دەبەستنەوە، ئەمەش لە بانگەشەکانی هەڵبژاردنەکاندا ئاشکرادەبێت، کەڕوونترین شێوازی سیاسیە بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات. کاتێکیش دەگەنە دەسەلات، ئەوەندەی

هێز و توانا بۆ پاراستنی دەسەڵات کاردەکەن، هێندە لە بەرژەوەندیی گشتیدا کارناکرێت.

ڕێچکەیەك لە بەردەم سیاسەتمەداری بێلایەندا لەبارە لە چوارچێوەی ئازادیدا، کە بتوانێت دەسەڵاتی گەل بەسەر دەسەڵاتی هەڵبژێراوەکان و دەسەڵاتە پارێزراوەکاندا بسەپێنێت کاتێك بڕوا بوون بە کۆمەڵ هەبوو، کاتێك جەختی کاراکتەریستیکی تاکەکانی ناو دەستە هەڵبژاردەکان لە سەر پاشەڕۆژی کۆمەڵگا سووربوو، ئەوا ڕاگەیاندن و کەناڵە کانی ڕۆشنبیرکردنی دەستەگەلیانەی کۆمەڵ ئاسانتر ئازاد دەبێت، ئەوەش لە ڕێگای گوشار و هەیت و هاواری ڕۆشنبیرە پۆزەتیڤە ڕاستگۆکانەوە ئەنجام دەدرێت.

مەرجی بێلایەنی بۆ سیاسەتمەدار لە بەرامبەر گرۆی سیاسیدا کارێکی گرانە لە نەبوونی ئازادیدا، بەڵام لەگەڵ بەدیارکەوتنی بچوکترین کلاوڕۆژنەی ئازادیدا، پێناسەی ئازادی سیاسی زۆر ناتەواوە گەر سیاسەتمەداری ئازاد دوور لەبەرژەوەندی گرۆی لایەندار بە دیارنەکەوێت.

جارێکی تر باسی کەناڵی ڕاگەیاندن دەکەمەوە، وەك کەرەستە وەك دەسەڵات، کەناڵی ڕاگەیاندنی ئازاد بەرهەم نایەت گەر سیاسەتمەداری بێلایەن پاڵپشتی نەکات و نابێتە دەسەڵاتی ڕاگەیاندنی گەر ئازاد نەبێت، ئەمانە گەرچی لە پێناسە سەرەتاییەکانی دیموکراسیدا بەڕوونی بەکار نەهێنراوە، بەڵام سیستەمی دیموکراسی، گەر ئازادی لە هەگبەکەیدا هەبێت، ئەوا بەڵگەنەویستە ئەم شێوازەی کاری سیاسی (بێلایەنی لە کاری سیاسیدا) خۆی دەسەپێنێت و جێکەوتی دەبێت. تاکە جوانیش کە لە فەلسەفەو شێوازە کرداریەکانی

دیموکراسیەتدا بەدی دەکەم ئازادی تاکەکانە کە دەکرێت لەو قۆناغەی مێژووی مرۆڤایەتیدا گەلانی چەوساوە و گرۆ لاوازەکان بتوانن سوودی لێوەرگرن و ئاراستەی بکەن.

بەهێزی سیستەمە دیموکراسیەکان لە ژیانی دیموکراتیزە کراوەوە سەرچاوە دەگرن نەك لە هەڵبژاردنەکانەوە.. کاتێك ژیان دیموکراتیزە کرا لە کۆمەڵگادا لە هەموو گرفتێکدا سیاسەتمەداری بێلایەن و کەناڵە بێلایەنەکانی ڕاگەیاندن دەنگ و بڕیاری دادوەرانەی گەل دەبێت.

لەم نوسینەدا پێویستە باس لە یەکسانی سیاسی بکەم، بەپێی سەرەتاییترین پێناسەکانی دیموکراسیەت، دەوڵەت کاتێك بە دەوڵەتێکی دیموکراسی دەژمێردرێت، کە یاسا بۆ هەمووان یەکسان بێت، هەروەها بەشداریکردن لە کاروباری دەوڵەتدا بە یەکسانی بێت و تەنانەت دەرفەت و بواری بەشداریکردن لە حوکمدا یەکسان بێت. کە ئەمانە هەمووی لەلایەن دەسەڵاتەوە نابەخشرێت گەر ڕۆشنبیرە چالاکەکان کاریگەریان لەسەر دەسەڵات نەبێت. ئەوە پەیوەندیەکی پێچەوانیە لە نێوان دەسەڵات و هێزە سیاسیە بێلایەنەکاندا، کاتێك دەبنە پاڵپشت بۆ یەکدی کە بتوانن لە بەرامبەر بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا سەردانەوێنن یان کاتێك کە کەسایەتیەکی بەهێز و بەخشندەییان تیادابێت بەرامبەر بەیەکدی، هیومانیستەکانیش هەمیشە لەم بوارەدا دەست پێشخەریان دەکەوێتە ئەستۆ.

هەروەك باسمانکرد، ئازادی سیاسی تەنها بۆ گرۆ سیاسیەکان نیە یان ئازادی سیاسی بۆ ئازادی هەڵبژاردنی گرۆکان نیە لە ڕیتمێکیتر دا، یاخود ئازادی

سیاسی تەنها و تەنها بۆ ئازادی دروستکردنی گرۆی سیاسی نیە لەسنووری یاسادا.. بەڵکو ئازادی سیاسی بۆ ئازادی بەشداری سیاسیە لە کاروباری کۆمەڵدا بەتاك و تاکرەویشەوە.. ئەم جۆرە ئازادیە سیاسیە سیاسەتمەداری بێلایەنی کارا دەهێنێتە بەرهەم لە چوارچێوەی سەرجەم چالاکیە کۆمەڵایەتیەکاندا.

لێرەدا رۆڵی بەرچاوی کۆمەڵی بوێر لە وەبەرهێنانی ئازادیدا دەردەکەوێت، دەردەکەوێت تا چ ئاستێك کۆمەڵ لە ئازادی بیر و ئازادی را و بەشداری سیاسیدا قالبووەتەوە و بە چ شێوەیەك ئازادی بەرز نرخاندوە و رێز لە بەرژەوەندیە کانی خودی کۆمەڵ و مافەکانی مرۆڤی بەرامبەری دەگرێت.

بەهەمان شێوە رۆڵی بەرچاوی دەزگا ((مونەسەسە)) کانی دەوڵەت دەردەکەوێت، تا چ ئاستێك دەتوانێت پارێزگاری رای ئازاد بکات و متمانە بداتە دانیشتوان و هاوڵاتی کە پەرە بداتە لایەنە سیاسیەکانی کۆمەڵ.. ئەوە ئەرکی سەرشانی ئەو دەزگا یانەیە کە ئاسایشی سیاسەتمەداری بێلایەن بپارێزن و بواری چالاکیەکانی بۆ بەپیت بکەن.

بە کورتی دەتوانم ئێستا بکەمە پێناسەی بێلایەنی لە سیاسەتدا کە بە شێوەیەك لە شێوەکان هاوتای ئازادی سیاسیە، بێلایەنی بەتەواوەتی واتای لایەنداری نەکردن بۆ هیچ لایەنێکی سیاسی، یان لایەنداری نەکردن بۆ هیچ شتێکی پیرۆزکراو گەر بیرێکی فەلسەفی، ئایدۆلۆژی یان مەزهەبیش بێت. بەڵکو لایەنداری کردن بۆ بیری سیاسی خود، ئەو خودەی کە دەکرێت پێی بوترێت

سیاسەتمەدار، واتە دەخوازێت و دەتوانێت ڕۆڵ ببینێت لە بواری کارە پەیوەندیدارە سیاسیەکانی کۆمەڵدا.

سپینۆزا سەبارەت بە ئازادی سیاسی دەڵێت ((بەهێزی دەوڵەت لە وەدایە چەندێك تاکەکانی هەستدەکەن ئازاد و یەکسانن، نەك هەر ئەوە، بەڵکو چەندێك پەراوەی ئازادی و یەکسانی دەکەن))، کاتێك بە دەستە هەڵبژاردە جۆراوجۆرەکانەوە نەتوانن لایەنی کەمی ئەو ئازادیە دەستە بەریکەن بۆ خۆیان و ئارگیومێنتی بەهێز و دانوستێنەری بەهێزین بۆ خۆیان بەرامبەر بە دەسەڵات، ئەوا زۆر ستەمە بتوانن بۆ سەرجەمی کۆمەڵی دەستەبەر بکەن. ئەمەش لە کاتێکدا ڕاستە کە نەتوانن پەراوەی تەکنیکە سیاسیەکانی سەردەم بکەن یان ئەو کەسێتیە بەهێزەیان هەبێت خۆیان بسەپێنن لە لای بەرەی دەسەڵاتدار، ئەوەی کەسێتی سیاسەتمەداری بێلایەن یان ڕۆشنبیری سیاسی لاواز دەکات، نەبوونی هەڵوێست و سلبی بوونی ڕەخنەگرانەیە تاسەر ئێسقان. ئەم شێوازەی کارکردنیش لە مەودای دووردا جگە لە بێ ئومێد کردنی هاوڵاتی دەبێتە دیفاکتۆیەك بۆ سووك کردن و بێبەها بوونی ڕۆشنبیر و ڕۆشنبیری.

گەشەکردنی تاك لە دەوڵەتدا بۆ خۆشویستنی نێوان تاکەکان و دوورکەوتنەوە لە ئازاردانی یەکتری هۆیەکی سەرەکیە بۆ بەرهەمهێنانی دەوڵەتێکی بەهێز. بۆ زیادکردنێکی پراکتیکی لەسەر ڕاکانی سپینۆزا، دەڵێین پاراستنی ئاسایشی سیاسەتمەداری بێلایەن و هەروەها بۆ وەبەرهێنانی مرۆڤی بە سوود کە هەوڵدانەکانیان بۆ چەوساندنەوەی یەکدی نەبێت لە ڕێگای شەڕ و توندوتیژی و تۆقاندنەوە، ئەرکێکی گرنگی سەرانی دەوڵەتە کە بەرجەستەی پەرەپێدانی سیاسەتمەداری بێلایەن بکەن کە سەرچاوەی ئازادی سیاسیە بەدیدی من.

بە دڵنیایەوە دەڵێم کاتێك تەرازووی بەرژەوەندی پێوەرێت، خولیاکان لە دەوری دەسەڵات دەگەڕێت. زۆرینەی ئەو سیاسەتمەدارانەی جیهان کە لە بۆتەی پارتێکی سیاسیدا کاردەکەن، بونەتە پیشەگەر بۆ پاراستنی ئاسایش و کەمێك لە بەرژەوەندیەکانیان، پارێزگاری دەکەن لە سیاسەتەکانی گرۆی بەهێز، مەلیك، سەوەر و سەرکردە نەکوژاوەکان.

ئالێرەوە گەل و بزوتنەوە سیاسیەکانی دەخەسێت. لە ڕووی جیۆپۆلیتیکەوە یان هاوزاڵیە سیاسیە نێو دەوڵتیەکانەوە لە پانتاییە جوگرافیە جیاجیاکاندا، زۆر بە کارایی دەتوانن کاریگەر بن لەسەر گرۆ سیاسیەکان، بەڵام هەرگیز ئەو کاریگەریەیان لە سەر تاکە سیاسیە کاراکان نابێت کە پەیوەندی دارنین بە ستراکچەری پارتی دەسەڵاتدارەوە.

بۆیە سیاسەتمەداری بێلایەن لە ژێر گوشاری ناچاری و درك نەکردن بە ئەرکی خۆی گەورەترین سەرمایەی خۆی لەدەست دەدات کە ئەوەش ئازادی سیاسیە. هێواش هێواش یەك لە دوایەك هەڵوێست وەردەگرێت، بەرامبەر بەوەش بەرژەوەندی و ئاسایشی دەپارێزرێت و ناتوانێت بەرامبەر هەڵەکانی پارتە پاڵپشتەکەی نەرمە کۆکەش بکات.

ئەم ئەرکە بەتەنها ناکەوێتە سەر دەوڵەت وەك دەزگایەکی گشتی بەرپرس لە هەموو ڕوداوو و دیاردەکاندا یان واتای بێ هەڵوێستی و تەناف بازی ڕۆشنبیرنیە. ڕاستە ئەرکی سەرشانی دەولەتە وەك ناوەندێکی بڕیار لە دەزگا گشتیەکاندا لەسەر ئاستی پەروەردەو ڕۆشنبیری و دەزگا کلتوریەکان

دەوەستێت.. بەڵام لەهەمان کاتدا ئەرکی سەرشانی کۆمەڵە بەگشتی و لە پەیوەندی خێزانەوە ئەو گەشەسەندنە دەست پێدەکات، هەرچۆن ئەرکی مامۆستایەکە رێز لە رای ئازادی منداڵێك بگرێ ئاوا ئەرکی سەشانی خێزانە رێز لە ئازادی راکان و بێلایەنی هەموو تاکەکان بگرێت. پارتە دیموکراتخوازەکان کاتێك بەهێز دەبن و مرۆڤدۆست دەبن گەر خۆشحاڵبن لە دەرەوەی پارتەکانیان سیاسەتمەداری ئازاد و بێلایەن هەبێت.. لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بە رەوای دەزانم پارتە سیاسیەکان ململانی لە گەڵ یەکتریدا بکەن و ببنە لەمپەڕ لە بەردەم دیدە جیاوازەکانی یەکتریدا بە هەموو توانایەکی ئازاد و ئاشتیانەیانەوە، بەڵام هیچ رەوا نیە گەر رێگرین لە بەردەم دەنگی تاکە سیاسیە بێلایەنەکاندا هەرچەندە ئاستی جیاوازی بیروڕاشیان بەرزبێت.

لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا ناخوازم بەشێوازێکی باو پێناسەی چین و توێژ و گرۆکان بکەم و جێکەوتی سیاسیان لەم نوسینەدا چی بێت باس بکەم، چونکە ئەو خاڵە بەرەو هەڵدێرگەی لایەنداریمان دەبات. گەرچی راستە ئاستی هێزی ئابووری رۆڵی سەرەکی دەبینێت لە دەستنیشانکردنی رۆڵی سیاسیدا و ئەوەش ئاستەنگێکی ترسناکە لە بەردەم سیاسەتمەداری بێلایەندا بۆ پارێزگاری لە ئازادی سیاسی خۆی.

مرۆڤ بە گشتی لە هەمان کاتدا چەوساوەیەو چەوسێنەریشە گەر هەموو نەگەرەکان بە دیدی هاوشێوە ببینین. ئەمە مەسەلەیەکی رێژەییە و قۆناغە ئابووریەکانی گۆڕانی کۆمەڵگای تێپەڕاندوە بەرەو جیاوازی نێوان نەتەوە و کەلتورەکان، بەڵام لە هەمان کۆمەڵگایشدا لە سەر ئاستی پەیوەندیەکانی تاك بەندە.

گەر ئێمە بمانەوێت باس لە سەر نەمانی چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ بکەین، ئەوا یەکەم هەنگاوی چەوساندنەوە لە پێشێلکردنی ئازادی سیاسیەوە دەست پێدەکات کەلە قۆناغەکانی منداڵیەوە سەرچاوە دەگرێت لە سنووری خێزانەوە.

حوکمڕانی لە چوارچێوەی قۆناغە مێژووییەکاندا هەمیشە دەرفەتی تێدابووە بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی کۆمەڵگا بە کەمینەی دەسەڵاتدار و زۆرینەی چەوساوەکانیشەوە، لەسەردەمە جیاجیاکاندا شێوازی شۆڕشگێڕانەی جیاوازی بەخۆوە بینیوە.. تەنانەت هێزە حوکمڕانەکانیش بشێوازێکی سەرزارەکی ڕەوتە شۆڕشگێڕەکان و پەیامەکانیان بەکاربردوە بۆ کەمکردنەوەی پەستانی بگۆڕ لە تەرازووی هێزە ناوخۆییەکاندا. هەروەها بالۆرە گشتیەکانیان خستوەتە خزمەت بەکاربردنی سیاسیەوە لە پارسەنگکردنی هێزە سیاسیە دەرەکییەکاندا.

لێرەدا باس لە سەددەی حەڤدەهەم دەکەین وەك نمونەیەکی ڕۆشن، دۆزینەوەی جیهانی نوێ لە بواری جوگرافیا و زانستە سروشتیەکاندا پێویستی بە پیاداچوونەوەی نوێ هەبوو بۆ تیۆری و بیر و ڕا سیاسیەکان، چونکە ئەو دۆزینەوە زانستیانە ئەوەندەی سەلماند کە توانای مرۆڤ بەسەر سروشدا زیاتر بووەو توانای زیاتری هەیە لە ڕووی تەکنیکی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە بۆ گۆڕان و چیتر باوی دۆزەکانی ڕابردوو نەماوە. ناوەڕۆکی ئەو گۆڕانانە کرۆکێکی ئابووری بەهێزیان هەبوو، لێرەوە دەرفەت لەبارتر بووە بۆ هەڵگرتنی ستەمی سیستەمەکانی شاهەنشاهی گەرچی بەشێوەیەکی کرداری زۆر زوو جێبەجێ نەکران.

له جیهانی ئەمڕۆدا لەژێر فشاری زانستەکانی ناو گەردیلە بۆ بچوکترین وردیلەکان لەهەمانکاتدا لە ژێر فشاری زانستەکانی بۆشایی بۆ گەورەترین سیستەمی گەردوونی و لە ژێر فشاری گەورەمامەڵەی بازرگانی ئازاددا. سیستەمە سیاسیەکان ناچارن ڕێگا بە ئازادی سیاسی نەگرن، بەڵام ئەرکی سەرشانی دەستە هەڵبژاردەکانە کە بتوانن ئازادی سیاسی ڕاستەقینە بەکردار بەرجەستە بکەن و هەڵوێستی ڕاستەقینەیان هەبێت بە جۆرێك کە لە بەرژەوەندی زۆرینەی مرۆڤەکانی کۆمەڵدا بێت. سیاسەتمەداری بێلایەن و ڕۆڵی لە کایە سیاسیەکاندا، گەورەترین هەڵپەیە بۆ بەرگرتن بە سیستەمە سیاسیە بەناو ئازادەکان هەروەها ئەوەش پیشان دەدات کە تا چ ڕادەیەك پارتە سیاسیەکان لە خزمەت بەرژەوەندی زۆرینەی خەڵکدان ((سەراپاگیرن)). سیاسەتمەداری بێلایەن لە سەردەمی کۆمپانیا فرە ڕگەزەکان و بازرگانی ئازاد و پەیوەندی ئازاددا ڕۆڵەکانی کەمتر نیە لە ڕۆڵی سەرکردە شۆڕشگێڕەکانی سەددەی نۆزدە و بیست و پێشتریش لە دروستکردنی تەوژمی جەماوەری بکۆڕدا، بەڵام ئەمجارەیان، شێوازی کار جیاوازەو ئاشتیانەیە بۆ گۆڕینی شێوازەکانی دەسەڵات و سیستەمەکانی حوکمڕانی. ئەم تەقەلایە بەدوور نیە لە شێواندنی ئازادی سیاسی وەك هەموو سەردەمە مێژووییەکان، لەژێر گوشاری بازرگانی بە ڕای سیاسی ئازادەوە. ئەمڕۆ لە جیهاندا پێودانگە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان لە زەقبوونەوەدان و ئاستی زانینی تاك فراوانتر و هەستەوەرترە لەسەر ئاستی بەرژەوەندیەکانی خۆی گەرچی بەرانبەر گرۆ کۆمەڵایەتیەکان لە پاشەکشەدایە و ئەرکەکان دەکەونە سەر دەستە هەڵبژاردەکانی وەك: (دەستە کارگێڕیە جۆراو جۆرەکان، هەڵبژاردە پەرلەمانیەکان، لێکۆڵەرەوەکان، نووسەران و لە دواداویی و لە پێش هەموانیانەوە سیاسەتمەداری بێلایەن).

چونکە سیاسەتمەداری بێلایەن بە ساناتر لە جاران کارایی خۆی بەرجەستە دەکات.

سروشت و کۆمەڵگا دوو ناوەندی تێکچڕژاوی ئاوێتەن کە ستەمیان لەسەر تاك هەیە، ئەم ستەمە زادەی خواست و دەگمەنیە، تاك هەمیشە هەوڵدەدات پێویستیە زگماکی (سروشتی) و کۆمەڵایەتی و ژیاریەکانی دابین بکات، کە ئەو دابینکردنە ئاسودەیی دەگەیەنێت بۆ تاك.. ئاسودەیی ڕەها نایەتە دی بە هۆی سنووورداری سەرچاوە سروشتی و کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژیەکانەوە، چونکە دەگمەنیان لە بوونیاددا هەیە. لە پرۆسەی هەوڵداندا بەدوای ئاسودەییدا تاك دەبێتە خاوەن زانیاری و ئەزموون، ئەو زانیاری و ئەزموونە بەڕای تاك گریمەی گونجاوی ئاسودەیی لە لا درووست دەکات.. ئەو گریمەیە لەسەر ئاستی جیاجیا کار لە ڕەفتاری تاك دەکات، لەو ساتەدا دەگاتە دەرئەنجامی گریمەیی، گەر نەبێتە دەرئەنجامی تیۆریش، بونیادنانی بیری خودی ئەو تاکە ڕاستە و ڕاست لە قاڵبی سیاسیدا خۆی دەدۆزێتەوە و بەوەندەش قایل نابێت و ناوەستێت دەبێتە چالاکی سیاسی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

ئەو سیستەمە سیاسیەی بەڕێوەدەچێت هەڵاویشتەی سروشت و کۆمەڵگایە کە سەرچاوەی دەگمەنیەکانن، ئەو سیستەمە سیاسیە لە خولیای بەڕێوەبردنی چارەسەری دەگمەنیدا سەمادەکات.. ئالێرە دا کارلێکی پێچەوانە دروست دەبێت بەم جۆرە:
سیستەمی سیاسی بەرقەرار کار لە پەیوەندیەکانی دەگمەنی دەکات، ئەزموون و بیر و ڕای سیاسی تاك خوازیارە کاریکاتە سەر ئەو هاوکێشەیە، بۆیە کارلێکە

پێچەوانەکان لە نێوان سیستەمی سیاسی و بیروڕای سیاسی تاکدا کارتێکەر و کارتێکراو دەبن لەیەك کاتدا.

ناخوازم لەم باسەدا بێمە سەر تیۆریەکی فیزیکی بۆ لێکدانەوەی وزەی کارکراو و بەستنەوەی بە بەهای ئابووریەوە، گەرچی باسەکەش دەشێت بەو جۆرە لێکبدرێتەوەو کاریگەرتر دەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا ناتوانم نەڵێم ئەزموون و ڕای سیاسی بەر ئەنجامی بەگەڕ خستنی توانستی تاکێکە لە بارودۆخ و پێشینەیەکی سروشتی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا، ئەم بەگەڕ خستنە لە زۆر ڕووەوە تێچوونی هەیە، کات، ئابووری، فیزیکی، بۆیە ڕاکانی تاك بەهایەکی تایبەتیان هەیە کە توانستێکی تیا بەکاربراوە، هەر بۆیەش گەر لە بازنە کۆمەڵایەتیەکاندا نرخیشیان نەبێت ئەوا بەهایەکی گەورەیان هەیە.

هەوڵەکانی ژیان جیاوازن  بە واتا ئەزموون و بیروڕاکان جیاواز دەبن، بەبێ گوێدانە مەودای جیاوازی ئەتوانین جارێکیتر بگەڕێینەوە بۆ جیاوازی لەسەر خاڵە گشتیەکان و جیاوازی لەسەر پێکهێنەرە وردەکان. ئەو سیاسەتمەدارانە لەچێوەکاندا کاردەکەن بڕیاری یەکانگیریان داوە لەسەر گشتیتر.. پانتایی پارتە سیاسیەکان چەند فراوان بێت ئەوەندە خواستەکان گشتی دەبنەوە، بۆیە بە دڵنیاییەوە سیاسەتمەداری لایەندار ئەزموون و بیروڕای تاکەکەسی خۆی لە زۆر باردا لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی پارتەکەیدا دەتوێنێتەوە یان ڕاستره بڵێین دەخاتە خزمەت پارتەکەیەوە. گەر تاکێکی سیاسی بێلایەن بێت ئەوا زیاتر توانای داهێنان یان ڕونترە  بڵێین پانتایی داهێنانەکانی فراوانتر دەبن ئەگەرچی لە دەرەوەی دەسەڵاتدا پانتایی چالاکی و کاریگەریەکانیشی لاوازتر دەبن. بەڵام لە گشتدا هیچ جیاواز ناکات لە توانای کارکردنی سیاسەتمەداری

لایەندار چونکە وەك باسمانکرد ئەوانیش سنوورەکانیان بەهەمان شێوە دیاریکراوە.

وەك لە پێشدا باسمانکرد پارتە سیاسیەکان هەوڵدەدەن بۆ دەسەڵات، ئەمەش پرۆسەیەکی کاتخایەنە، لە ڕاستیدا پارتە سیاسیەکان لە بارودۆخی مێژوویی دیاریکراودا دروست دەبن و بۆ بارودۆخی سیاسی دیاریکراویش ئەرزشی خەباتیان هەیە و دواتر بەردەوام بوونیان بریتیە لە پرۆسەی بوون بە کۆمپانیاو زەبەلاح بوونی ئەو کۆمپانیایانە. پارتە سیاسیەکان جەستەی زیندوون لە دایکی کۆمەڵگاکانەوە ژیانیان پێدەبەخشرێت.. لەهەمان کاتدا مردنیش چاوەڕوانیان دەکات نەك بە جەستە بەڵکو بە کاریگەریان لە سەر شانۆی سیاسی و گۆڕانی بەردەوامی کۆمەڵەکانیان. هندێك لەو پارتانە دەتوانن بە زیندوویی بۆ ماوەی درێژخایەنتر لە وانیتر بەردەوام ببن ئەو بەردەوامیە ئەنجامی کاری سیاسەتمەداری بێلایەن زیاد دەکات. گۆڕانەکانی ناو کۆمەڵ لە گەڵ تێپەڕاندنی مێژوودا خێرادەبێت، بۆیە پارتە سیاسیەکان بە ئاسانی ناتوانن دروستببن لە گەڵ خواستی دروستکەرەکانیاندا بۆ دروستکردنیان لە منداڵانی گۆڕانە خێراکانی کۆمەڵگادا لە باردەچن، بۆیە ڕۆڵی زیاتر بە سیاسەتمەداری بێلایەن ئەبڕێت تابتوانێت بە بەردەوامی ڕەخنە لە بەرنامە سیاسیەکان بگرێت و ئەڵتەرناتیڤی باشتر پێشکەش بە گۆڕانکاریەکان بکات لە بۆ کۆمەڵ و هەڵسەنگاندنەکانی ئاسۆکانی بڕیار داڕێژێت، گەرچی بڕیاردەرەکان دەزگا و دەسەڵاتی تریش بن.

لەکاتی نەبوونی مافەکانی باسکردن و لەچاپدان و جێبەجێکردنی سیاسیانەی ئازاددا، ئەوا تاك کاتێك خواستی بێت لە بواری سیاسیدا کار بکات، ناچار

دەبێت هەڵبکات ئەوەش لە ئەنجامی لایەنداریەوە چونکە هەمیشە خواستی زۆرینەیەکی پەلکێشکراو بۆ گرۆیەك جێبەجێدەکات ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت کە نەتوانێت لە ئاسوودەییدا بژی.

لەم بارەدا مرۆڤ دەبێتە کەرەستە بۆ جێبەجێکردنی خواستی خەڵکانی تر و کەرەستەی ئاسوودەیی کەسانێك کە خواستەکانیان جێبەجێکراوە و دەکرێت.. ئەمەش لەخۆیدا پرۆسەیەکی درێژخایەنە و تاکی ئاسایی بە ئاستەم درکی پێدەکات، بەڵام نەنگیە گەر کەسانی سیاسی توشی مەترسیەی و دڵەڕاوکێ نەبن لە بەرامبەر واقعە سیاسیەکاندا هەروەها نەنگیە گەر توشی دڵەڕاوکێ ببن لە بەرامبەر تێگەیشتن لە واقع و ڕاستیەکان.

نەبوونی سیاسەتمەداری بێلایەن واتە نەبوونی دەرفەت بۆ پەراوەی سیاسیانەی بێلایەنی، لە کۆمەڵگادا پرۆسەیەك بەرقەراردەبێت کە ئەوەش مۆنۆپۆلکردنی بیرکردنەوەیە کە بە ڕای من هاوسەنگکردنێکی سفریە بۆ هێزی بەرهەمهێنانی بیری سیاسی. چونکە دەرفەتی زەقکردنەوەی بیروڕا نەیارەکان دەکوژرێن لە لایەن ئاراستە باوەکانەوە. بە شێوەیەکی گشتی کەم بوونەوەی ئەڵتەرناتیف و مانەوەی کۆمەڵ لەسەر تەرزی باو خەسڵەتی ژیانی سیاسی ئەو کۆمەڵگایە دەبێت. تەوەرە سیاسیە باوەکان دەبنە تەنها میمبەر بۆ دەربڕین کە بە ناچاری ئارەزوومەندان و پیشەوەرانی سیاسەت بۆ چالاکیەکانیان دەبێت ڕوویان تێبکەن یان چەند کەسێك کۆببنەوە بۆ بنیادنانی تەوەرەیەکی نوێ کە زوو بێت یان درەنگ دەبێتە تەوەرەیەکی باویتری سەردەمی پاش خۆی.

مرۆڤ هەمیشە لە ژێر کارتێکردنی چەند هێزێکی دەرەکی و ناوەکیدایە، بەرئەنجامی ئەم هێزانە ئاراستەیەکی دیاریکراو وەردەگرێت. ئەو ئاراستە یە بەرەو یەکێك لەتەوەرە باوەکانی دەبات، تەنانەت ڕەخنە گرتنیش دەیخاتە پاڵ یەکێك لە تەوەرەکان.

سیاسەتمەداری بێلایەن پێویستە جێی متمانەی هیچ تەوەرەیەکی سیاسی باو نەبێت تابتوانێت لە بەرژەوەندی گشتیدا کاربکات.. سیاسەتمەداری بێلایەن یەکێك لە بنەماکانی دروست بوونی بریتیە لە ڕەخنەگرتنێکی بە بەرنامەی بەردەوام لە بەرنامە باوەکان، کاتێك ڕەخنەکان دژ بە تەوەرەیەکی باوبن، پێویست ناکات کەسێتی سیاسی بێلایەن یان ڕاکانی ببنە دەستە گوڵی لایەنە نەیارەکان، چونکە هیچ سەرکەوتن نیە بۆ سیاسەتمەداری بێلایەن کاتێك تەوەرە باوەکان ببنە پشت و پەنای لەسەر بنەمای دژایەتی لایەنە نەیارە باوەکانیتر.

لە هەمان ئەلگۆدا سیاسەتمەدار دەتوانێت پارێزگاری لە بێلایەنی خۆی بکات بە تەسلیم نەبوون بۆ هیچ تەوەرەیەکی باو، ڕەخنەگرتن لە مرۆی بارودۆخی سیاسی کۆمەڵ و خۆ ئامادەکردن بۆ خستنە بەر باسی ئەو سبەینانەی کە بەرهەمی ڕەخنەکانی ئەمرۆیە. هەر کاتێك سیاسەتمەدار هەستی کرد بە چەترێکی باو کە پارێزگاریدەکات، ئەوا بێپرسیار بێلایەنی سیاسی خۆی لەدەست داوە. هەرکاتێك سیاسەتمەدار هەستی کرد هەموو جەماوەر یان زۆرینەی زۆری جەماوەر لەگەڵ ڕاکانیدا تەبان، ئەوا خودی خۆی بووەتە باو. هەرکاتێك سیاسەتمەدار هەستی کرد دەتوانێت جەماوەر لە دەوری تێزە نوێکانی کۆبکاتەوە بۆ گۆڕینێکی پۆزەتیف لە کۆمەڵگادا، ئەو تێزەی ئەویش

بەرهەڵستکاری زۆربوون، ئەوا توانیویەتی ڕۆڵ ببینێت وەك سیاسەتمەدارێکی بێلایەنی ڕاستەقینە.

ئەم ئەگەر و ئەوایانە زۆر کارێکی ئاسان و سادە نین لە بۆ کاری سیاسی، بەڵام ئەوەش داینەمۆی بەرەو پێش چوونی کلتوری سیاسیە گەر مرۆڤ بخوازێت سیاسیەکی کاریگەر و ئازاد بێت. دروست بوونی ئەم جۆرە لە سیاسەتمەدار بە ناڕاستەوخۆیی واتای دروست بوونی هێزێکی ئاسایی، کە دەتوانێت ژیانی ئاسایی و سروشتی کۆمەڵ بەرەو پێش بەرێت. ئەم جۆرە بەرهەم و ئاکامانە زادەی کۆمەڵگایەکی ئازاد و بوێرە کە دەتوانێت جەماوەر لە دەوری دیاردە سیاسیە ناسروشتیە زیانبەخشەکان بوروژێنێت و گرۆکانی فشاری سەر دەسەڵات بەهێز بکات. کە پڕاوپڕ ئەمە ئەرکی ڕۆشنبیری سیاسیە نەك سلبی بوون لە کارە ڕەخنە ئامێزە بەتەنها نوسراوەکاندا.

گۆڕانکاری نائاسایی تەوژمی نائاسایی و کاریگەری نائاسایی بە سەر کۆمەڵەوە بەجێدەهێڵێت.. بۆ ڕاگرتنی پارسەنگی هێزە ناوەکییەکانی کۆمەڵ و بەرگرتن بە هێزە بەرژەوەندی خوازەکان سیاسەتمەداری بێلایەن هێزێکی کارایە کە لە بەرژەوەندیەکی کشتکرتردا توانای کارکردنی هەیە، چەندێك ئاستەمە و بوێری دەخوازێت ئەوەندەش زیاتر ئاکامی پۆزەتیڤی لێدەکەوێتەوە.

لە چوارچێوەی ئەم واقعە تاڵەدا و بەبەشداری بەختیاری عەلی لە پەراگەندەکردنی فکری کوردیدا، بۆمن شاراوە نیە کە لە ڕووی عەمەلیەوە هێزە ئیسلامیەکان و ئەمریکا زۆر باش دەزانن چ تیوری و فکرێك بەکاردەهێنن بۆ پەراوەی سیاسی خۆیان و دابڕاویش نین لەو تیۆری و کلتورە، هەروەها لە

ناخی خۆیاندا ئەوەش بەرجەستە دەبێت. ئەوەی بەلای منەوە سەیرە ئەوەیە کە بەختیار عەلی ناتوانێت بەباشی و بابەتیانە لەوە تێبگات کە بە لۆژیکێکیتر هێزە ئیسلامەکان زۆر شتیان هەیە بیدۆڕێنن و بە پێچەوانەوە ئەمریکا هیچی نیە بیدۆڕێنێت، یاخود راستیەکان لەوەدایە کە لە جەنگەکانی ئەواندا ئێمە چی دەدۆڕێنین. بە دڵنیایەوە هەردووکیان شتیان زۆرە بیدۆڕێنن، هەرگیزیش ناکرێت کەسیان بە نوێنەری تاریکیەکی موتڵەق بزانین و ئەویدی بە نوێنەری رۆشنایی، لێرەدا بەد حاڵی بوون بەدی دەکەم لەبەرامبەر تێگەیشتن لە واقعی کلتور و سیاسەتمەدارەکان و بزووتنەوە سیاسیەکانی ئەو کلتورانەدا. ئەمە جۆرێکە لە هەڵخەڵەتاندن بەرامبەر بە بەهاکانی خۆرئاوا و شوێن کەوتنێکی تر بۆ بەهاکانی عاتیفەی خۆر هەڵاتی و خۆسزادان.

(١٠)

بۆ ئەوەی پاش ئەو هەموو لێکدانەوەیە و خستنە رووی بیرۆکەی سیاسەتمەداری بێلایەن پێویستە جارێکیتر بێینە ناو باسەکانی ئەمڕۆی نێوان هێزە ئیسلامیەکان و سیاسەتی ئەمریکی. تالیبان بزووتنەوەیەکی ئیسلامی خوێندکارەکانی خوێندنگە ئیسلامیەکانی پاکستانە، هۆکارەبابەتیەکانی درووست بوونی تالیبان دەگەڕێتەوە بۆ:

١. سەرئەنجامی شەڕی ناوخۆی ئەفغانستان.
٢. کوشتارەکانی نێوان سونە و شیعە و لایەنەجیاجیاکانی ئەفغانستان.
٣. پاشاگەردانی ناو ئەو وڵاتە.
٤. داهێزرانی ئەخلاقی کۆمەڵگای ئیسلامی لە ئەفغانستاندا بە دیدی ئەو خوێندنگانە.
٥. پێشینەی سەربازی سەرکردەکانیان.

٦. ئەزموون و ڕیشەداکوتانی چارەسەری سەربازی لە کێشەسیاسیەکانی ئەو وڵاتەدا.
٧. کاریگەری جیهانی ئیسلامی و بیری ئیسلامی لەسەر ئەو وڵاتە.
٨. دارمانی ژێرخانی ئابووری و تەکنەلۆژی وڵاتەکە بۆ سەرهەڵدانی هێزێکی سیاسی لە جۆری تالیبان.
٩. بەپێتی داب و نەریتی بەشتوونەکان کە زۆرینەی ئەفغانستان پێکدەهێنن.
١٠. کاریگەری هێزە ئیقلیمیەکان بۆ خۆشکردنی زەمینەی سیاسی و کۆمەڵایەتی درووست بوونی تالیبان.
١١. پێیاش بوونی ئەمریکایی لە پرۆسەی درووست بوونی تالیباندا.

تالیبان کە لە زۆرینەی بەشتوون پێکهاتووە و نزیکەی ٩-١٠ ملیۆن کەس دەبن کە بە کەلەپوری خۆیانەوە زۆر دەنازن و بەدرێژایی چەندین سەددە تیایاندا چەسپاوە و زیاتر گرنگی بە کەلەپوری بۆماوەیی خۆیان دەدەن، هەروەها ئەم گرۆیەی کۆمەڵگای ئەفغانی ژیانێکی سەخت و گیانێکی بەهێزی بەرگریان هەیە. نمونەیەکی سادەی ژیانی ڕۆژانەی ئەم گرۆیە، گەنجەکانیان توانای بەرگری خۆیان بەوە پێوانە دەکەن کە چەند دەتوانن پشکۆ لە ناو لەپی دەستیاندا بکوژێننەوە بەبێ هاوار و دەربڕینی هەستکردن بە ئازار(٥).

ئامانجەکانی هێزە ئیسلامیەکان بەگشتی: دروستکردنی دەوڵەتێکی ئیسلامیە لەسەر سیستەمی حوکمی خەلافەت، و هەڵبژاردنی زانا ملتەزیمەکان بە ئیسلامەوە بۆ پۆستە گرنگەکانی دەوڵەت، پێداگرتن لەسەر ڕێکپۆشی ئیسلامیانە بۆ ژنان و ناچارکردنی بەو سیستەمە، بنەبڕکردنی تاوانە ئەخلاقیەکان بە دیدی ئیسلام، ئامادەکردنی سوپایەکی مەشق پێکراو بۆ

پاراستنی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەترسیە دەرەکیەکان و دامەزراندنی دەزگایەك بۆ جیاکردنەوەو کارکردن بە چاکە و نەی کردن لە خراپە لە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامیدا. هەروەها لە ڕووی ئابووریەوە بە ئیسلامیکردنی ئابووری و کۆکردنەوەی زەکات و دەیەو خێر وخێرات و بەکارهێنانی لە پرۆژە ئیسلامیەکاندا.

لە ڕووی فەلسەفەوە پشت بە بیروڕای مەزهەبە جیاجیاکان دەبەستن و هەر هێزێکی سیاسی ئیسلامی شێوە ڕێکخستنێکی لە بنەماکانی ئەو مەزهەبانەوە وەرگرتووە، کە هەندێکیان باوەڕیان بە ئیختیار هەیە و هەندەکەی تر باوەڕی بە جەبر هەیە.

لە ڕووی دیموکراسیەوە هیچ بڕوایەکیان بەو دیموکراسیەتە نیە کە گەل حوکمی خۆی بکات بەڵکو حوکمەکان تەنها بۆ خوا دەگەڕێننەوە و وڵاتیش لە لایەن ئەمیرەوە یان مورشیدەوە یان ڕابەرەوە بەڕێوە دەچێت کە سەرجەمی زانایان دەست نیشانی دەکەن و بە درێژایی ژیانی ئەمارەت دەبا بەڕێوە. ئەم بزووتنەوانە گەر سەیری گۆڤارەکانیان بکەین زۆربەی شتەکانیان لە چەند تیۆریستێکی ئیسلامی سەددەی بیست وەرگرتووە وەك (سەید قتب) و زۆر کاری تێکردون.

ئەم ڕەوتە سیاسیانە گەرچی پەراوەی چالاکی حیزبی دەکەن، بەڵام زیاتر پشت بە ئینتمای کۆمەڵگەلی دەبەستن و دەیانەوێت بەرژەوەندیەکانی گەل بپارێزن لە ڕێگای دامەزراوەکانی دەوڵەتەوە، تەنانەت جێبەجێکردنی فەرزەکانی ئیسلام

وەك فۆرمی بەئەندام بوون سەیر دەکەن و هیوایان بەوە هەیە کە تاکی ئیسلام داکۆکی لە مەسەلە ستراتیژیەکانیان دەکات.

هۆکارەکانی پتەوی ڕیزەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ:

١. هاوبیری ئەندامەکانیان.
٢. دڵسۆزیان بۆ بیروباوەڕەکانیان.
٣. بەخشینی دەسەڵاتێکی ڕۆحی بە ئەمیرەکەیان یان مورشیدەکەیان یان کەسی یەکەمی سەرکردە.
٤. ترسناکی بزووتنەوەکە لە ناخی ئەندامەکاندا.
٥. سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی کە وەك ستراتیژێك بەکاردەهێنرێت.

گەر بە نمونە کۆمەڵگای ئەفغنانی وەربگرین، ئەوا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئەفغانی، کە بە سروشتی خۆی توندڕەون بەرامبەر تێکەڵاوی ژنان لە گەڵ پیاوان و پێیان قبوڵە جیاکاری بکرێت لە نێوان ژنان و پیاواندا، لە ڕاستیدا داب و نەریتی گوندەکانی ئەفغانستان بە سروشتی خۆی لەسەر تەرزی حوکمی تالیبان بەڕێوە دەچێت بەبێ ئەوەی پێویستی هەبێت بە دەزگاکانی ئەمر بە چاکە و نەی لە خراپە. بە پێچەوانەوە کابولی پایتەخت کە جۆرێك لە ئازادی هەستی پێدەکرێت لەو کلتورەی ئەفغانستان. لە ڕووی ئابووریەوە ئەفغانستان، لە گێژاوێکی ئابووری ترسناکدا دەژی گەر بەراوردی بکەین بە هەر وڵاتێکی تری دونیا. هیچ کارخانە و ژێرخانێکی ئابووریان نیە، تەنانەت لە ساڵانی ڕابردوودا، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئەم وڵاتە لەسەر هەڵدانەوەی گۆڕ و فرۆشتنی ئێسقان دەژیان.

لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئەم بزووتنەوانە لە بەر چاوی خەڵکی ناوچەکانیاندا، لەم خاڵانەدا خۆیان دەبیننەوە:

١. وەك هەموو بزووتنەوەیەکی ئۆپۆزسیۆن بانگەشەی بەدەست هێنانی ئەو داخوازیانە دەکەن کە دەسەڵات نەیتوانیوە دەستەبەریان بکات یان نەیویستوە دەستەبریان بکات. ئەمەش لە سەر ئاستی دەسەڵاتی ناوخۆیی و دەسەڵاتی گلۆباڵی پەراوە دەکەن، کە پەراوەکردنەکەش بە دوو میکانیزمی جیاوازە و بەپێی دوو ویستی جیاوازە.

٢. بەدیدی ئیسلام گەندەڵی ئەخلاقی زۆر جیاوازە لە دیدگاکانی تر و تاکە سەرچاوە و شەرعیەتە کە بەکاری دەهێنن بۆداواکردنی دەستگرتن بەسەر دەسەلاتدا.

٣. سەرجەم نا عەدالەتیەکان دەگەڕێننەوە بۆ نا دادوەری و بەڕای ئەمان دەبێت دادگاکان بە ئیسلامی بکەن، بەڵام دادوەری جیاوازی هەیە بە دیدی ئەمان، ئەکرێت مرۆڤی ئاسایی لەسەر مەسەلەیەکی زۆر سادەو ساکار کە پەیوەندی بە ئازادی خودەوە هەیە تاوان بار بکرێت و سزابدرێت. لە کاتێکدا سزای گەورەترین تاوان لەوانەیە پێناسە بکرێت بە بێتاوانی.

٤. داکۆکی کردن لە خەڵکی هەژار و بێدەرەتان پیشان دەدەن و لە فەلسەفەکانیاندا بەزەیی تاکە ڕێگاچارەیە بۆ ڕزگارکردنی ئەم گرۆیانە نەك بەهێزکردنی گرۆ پەراوێز بووەکانی ناو کۆمەڵ.

دێمە سەر دیدگایەکی تری ئیسلامی کە لە دیدی قەرەزاویەوە دەتوانین قسە لە سەر فەساد و تێگەیشتنی فەساد لە گلۆبەلایزەیشنی ئیسلامیدا بکەین. قەرەزاوی قسە لە سەر تێڕوانینی ئیسلام بۆ بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا و پاشان

تەعبئە كردن بۆ لێدانی بەرژەوەندیەكان دەكات، كە دەڵێت: (پێویستە بەرامبەر ئیلحادێك بوەستینەوە كە باوەڕی بە خوا و پێغەمبەرەكان نیە، پێویستە بەرامبەر ئازادی سێكسی و سێكسی هاوشێوەدا بوەستینەوە، هۆمۆسێكچواڵیتی، ئەوانەی یانەی سێكسی و ڕووتخانەكانیان كردووەتەوە، پێویستە دژ بەو جەورو ستەمانە بوەستینەوە كە لە بەرامبەر گەلی فەلەستینیدا ئەنجام دەدرێت).

قەرەزاویش باوەڕی بە بەرەنگار بوونەوەی تیرۆر هەیە بەڵام لەلای قەرەزاوی ئەوانەی چەكدارن بۆی هەیە بیانكوژێت، تەنها ئەوانەی چەكدار نین و هاوكاری جەور و ستەم ناكەن، گەركوژران ئینجا ناودەبرێت بە تیرۆر.

فەلسەفەی بەربەرەكانی و جەنگە پێویستەكانی ئەو بەربەرەكانیە لە لای قەرەزاوی بریتیە لە: شەرعیەت دان بە خۆتەقاندنەوە، چونكە خەڵكانی بێدەسەڵات و گوشار لەسەر، توانای سەربازی و جبەخانەی تێر و تەسەلیان نیە، توانای ئەتۆمیان نیە، لە هەمان كاتدا بەرەی دژ بە ئیسلام ناتوانن قوربانی بە خۆیان بدەن چونكە هیچ ئیمان و باوەڕێكیان نیە.

شەڕەكە شەڕی نێوان دوو تێزی كاركردنە لە سیاسەتدا هەرچۆن لە دوو باككراوندی زانیاری و تەكنەلۆژی و كلتوریەوە داتاشراون تا دەگاتە ئەمڕۆ، ئەوەی لەلای ئەمریكیەكان بە تیرۆریست ناوزەن دەكرێت، یان ئەوەی لای ئیسلامەكان بە تیرۆریست ناوزەند دەكرێت، هەردووكیان ڕاستە! تیرۆریست كەسێكە خاوەن بەرژەوەندیە جا بەرژەوەندیەكە ماددی بێت یان نا ماددی (بەهایی)، بەڵام گرنگ ئەوەیە كۆمەڵگای ئێمە و سەرجەمی خەڵك بزانێت كە

ئەو بەرژەوەندیانە بەرژەوەندی سەرجەمی نین بۆ هەموو خەڵك، بەڵكو بەرژەوەندی نێوەندەکانی دەسەڵاتە جیاجیا کانە کە جارێکی تر هەندێ لەو دەسەڵاتانە ماددیە و هەندەکەی دی ناماددین. کە ئەمە بەهیچ شێوەیەك ناکرێت تەرجەمە بکرێتە سەر شەڕی نێوان حزبە کوردیەکان و گرۆیەکی وەك جوندولئیسلام، چونکە وەك ڕوونمانکردەوە ئەو شەڕە پێشینەیەکی تری هەیە و هۆکاری تر هەن بۆ درووست بوونی بەتەنهاش هۆکان ناوەکی نین. خەتا لەوەدایە ئێمە بەتەنها شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی بە هۆکار بزانین.

تیرۆریستی خاوەن بەرژەوەندی ماددی خاوەن مەسەلەیەکی ماددیەو دەیەوێت بەها پیرۆزەکان و وشە جوانەکان بخاتە بەر تیشکە ڕووناکەکانی دیاردە گلۆباڵی و شارستانیەتەکانی خۆیەوە، بەڵام لە ڕاستیدا خاوەنی بەهایەکی ئەخلاقی هیومانیستی پەیت نیە. لە هەمان کاتدا تیرۆریستی خاوەن بەرژەوەندی ناماددی تەواو بەدەرە لە بەرژەوەندیە ماددیەکان و تەنها خاوەن مەسەلەیەکی بەبەهایە، بەهاکانی خۆشی بە میتۆدگەلێکی زۆر هیومانیستیانە دەخاتە ڕوو گەرچی لە گەڵ وەرچەرخانی تەرازووەکاندا ئەویش دەکەوێتەوە هەمان ململانێی دەسەڵات و پیادەکردنی هەمان ڕیتمی سیاسی بە فۆرمیتر. بەرەی یەکەم کە باسمان کرد ڕێگای سیستەم و دەوڵەت و دامەزراوەکانی هەڵبژاردووە بۆ پەراوەی سیاسەتی خۆی، هەرچی بەرەی دووەمیشە وەك دیاردە خۆی سەپاندووە و بە تەواو بوونی بن لادن تەواو نابێت و چەندین بن لادنیتر هەیە! ڕق و کینەی بەرەی دووەم زۆر ئاسایی لە خەڵکی بێتاوانیشدا خۆی بەتاڵ دەکاتەوە، هەرچۆن بەرژەوەندیەکانی بەرەی یەکەم بەڕەوای دەزانێت بۆردومانەکانی خەڵکی بێتاوانیش لەناو بەرێت. گرێکە لەوەدایە، کەی هیومانیزم دەتوانێت لە بەربەرەکانی بەرژەوەندیەکان و بن بەست بوو

ئایدۆلۆژی خۆی ڕزگار بکات؟ چۆن هیومانیزم دەتوانێت میکانیزمێك بدۆزێتەوە بۆ قورتار بوون لەو گرێیە؟ کاتێك خەڵکی بێچارە سەیری سیاسەتەکانی ئەمریکا و پاشکۆیەتی سیاسەتی وڵاتی خۆی بۆ ئەمریکا دەکات، ناچارە ڕق و کینەکانی بە خۆی و دەرەوەی خۆی بڕێژێت، چونکە دەگاتە ئەو ئاستەنگەی کە ئەو هەموو شتێکی لیَ مۆنۆپۆڵ کراوە، ماوەتەوە بەهاکانی کاتێك بەهاکانی دەکەونە ژێر مەترسیەوە دەبێتە بچووکترین گڕ بۆ سەندنەوەی ئەو بەهایانە لە دەسەڵاتەکەی بەرامبەری بەڵام گەورەترین مەترسیە بۆ خەڵك، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە بەها کانی کۆمەڵە ئاینیەکان ڕێگرن لە بەردەم تەکنەلۆژیا و بازاڕی سەرمایەداریدا لە هەمانکاتدا، لیبرالیزمی نوێش لە چەسپاندنی ئارامیدا نەبێت ناتوانێت گەشەی پێویستی خۆی بکات، ئەگەرچی سیاسەتی ئابووری و سەربازی ڕادیکالیزمی سەرمایەداری تەنگژی بۆ مەرامەکانی نیولیبرالیزمیش درووست دەکات. ئائەمەیە جوغزی سەرپێبوونی ڕۆشنبیرەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات کە دەکەونە نێو تۆڕی بانگەشە ئیعلامیەکانی جەنگی بەرپاکراوی ئەمڕۆ، چونکە فەلسەفەی بەربەرەکانی گلۆباڵیزمی ئیسلامی ئاستەنگە لە بەردەم چەسپاندنی ئارامیدا. لەهەمان کاتدا بۆ ئیسلامەکانیش هەمان هاوکێشەی پێچەوانە ڕاستە چونکە بەهیچ کلۆجێك ئازادی لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئیلاهیدا قابیلی قبولّ نیە. بۆیە هەرچۆن ئەمریکیەکان دەخوازن لە ئاوە گەرمەکاندا جێپیّ و بازاڕیان هەبێت، ئاواش ئیسلامەکان دەخوازن لە ئەمریکا و ئەوروپادا مزگەوت و جەماوەری کۆبوونەوەی ڕۆژانی هەینیان هەبێت.

ئایا موتڵەقەگەرایی لیبرالیزم و ئیسلام تا چەندێك دەتوانن پارێزگاری لە کراوەیی خۆیان بکەن؟ ئایا لە دونیای سیاسەت و بەرژەوەندیە جۆراو جۆرەکاندا کرانەوە تا چ ئاستێکە؟ تاسەر ئێسقان یان هەر لە توێژە

ڕووکارەکاندایە؟ ئەو تیرۆرەی ئەمریکا پەراوەی دەکات و ئەوەی گرۆ ئیسلامیەکان دەستیان داوەتێ ڕاستگۆیی تیزە موتلەقەکانیان نیە بەڵکو پەراوەکردنی نهێنیە شاراوەکانی ناو دونیایەکە کە بەتەنها کرانەوەیەکی ڕووکەشی بەخۆوە بینیوە و گلۆبەلایزەیشنی ئابووری و سیاسیش لە سەر ئاستە جیاجیاکان بەو جۆرە دەخوازن، بۆیە بە هەموو تواناکانیانەوە کەرەستەکانی بواری ڕۆشنبیری گلۆبالێکراو بۆ ئەو مەبەستانە تەرخان دەکەن. دونیا هێشتا لە و جوغزی توندڕەویە پاکنەبووەتەوەو بەو ساددەیەیش پاك نابێتەوە، بەڵکو زیاتری دەوێت، ئەوەی خەمساردی پیشانداوە ئەو دەستەهەڵبژاردەیەیە کە پێی وایە بەتەنها لە ڕێگای گفتوگۆی نێو خۆیانەوە و بەزمانێکی بەدحاڵیانەش لە گەڵ خەڵکدا دەتوانن دونیا بکەنە کۆمەڵگایەکی بێخەوش و حاڵی لەیەکتر.

میکانیزمی کاری سیاسی گرۆ بچوك و گەورەکان لە سەرەتای سەرهەڵدانیانەوە سەنگەرێکی دواوەی بەریەرەکانیان بەهێزکردووە بۆ ئەو ڕۆژەی ناگەنە ئەنجام لەگەڵ بەرامبەرەکانیاندا.

ئەوە بەتەنها میکانیزمی دونیای ئیسلامی یان ئەمریکی نیە کە خۆی لە دەرەوە دەپارێزێت نەك لە ناوەوە، بەڵکو سەرجەم گرۆکان و سیستەمەکان کار بەو میکانیزمە دەکەن، ئەو وڵاتانەی کۆنترۆڵی بانکە جیهانیەکانیان کردووە و ناوەندی بڕیارن لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیدا لە هەموو وڵاتێکیتر زیاتر خۆیان پڕچەك دەکەن، تەنانەت بودجەی ساڵانەی سەربازیان دەیان ئەوەندەی بودجی هەموو وڵاتە هەژارەکانە بەیەکەوە، کە ئەمەش هەر لە مەترسی دەرەوەیە.

نەخۆشیەکە لەوەدا نیە کە بەتەنها فۆبیاکانی ئوسامە یان فۆبیای سیستەمی ئەمریکی جەنگ هەلگیرسێنێت، بەلکو ئوسامە زۆر باوەڕی بە ئیسلام هەیەو بە پشتیوانی تیۆریستەکانی ئەمڕۆی دونیای ئیسلامی کاردەکات، ئوسامە ئەو کەسەیە کە توانیویەتی تواناکانی خۆی بخاتە گەڕ لەپاڵ توانای هاوشێوەکانی بۆ بەرقەرار کردنی ژیان لە سەر ئاستی جیهانی بە تەرزێکی ئیسلامی، ئوسامە گەر باسی لە هەر مەسەلەیەکی تر بکردبایە تواناکانی بۆ ئەو خەباتە بەگەڕبخستایە ئەوەندە شکستی نەدەخوارد، ئوسامە و بیریارانی ئیسلام ئەلتەرنەتیفی ئیسلامیان بۆ مافەکانی مرۆڤ و پێکەوەژیانی گەلان پێیە لەسەر بنەما فکری و فەلسەفیەکانی ئیسلام، من لێرەدا باس لە ئەلتەرنەتیفی تر ناکەم بۆ ئەو تیۆریانە، بەلام بچوك کردنەوە و لەبار بردنی سەرجەم نێگەتیف و پۆزەتیفەکان بەیەکەوە دووریە لە واقع، نەبوونی زانیاریە لەسەر دیاردەکان، نەخواستن و نەبوونی ئازایەتیە بۆ بەشداری کردن لە گۆڕاندا، ئەمانە بەهەمان تەرزی نیولیبرالیزم کار دەکەن کە لە ناوەڕۆك و مەغزا مەعریفیەکاندا جودان دەنا ئوسامە هەروا سادەو ساکار و وەحشی نیە بەرامبەر بە مرۆڤایەتی بەدیدی خۆی هەر چۆن سیستەمی ئەمریکی بۆ ژیان دەلێت برۆ تۆش ئازاد بە و تاتشەریزم دەیەوێت سادەترین سیماکانی کشانەوەی دەولەت لە بازاڕو هێنانە کایەی سەرمایەداری بە دەسەلات شادبکات.

بەرلەوەی بچینە سەر بەراوردێك لە نێوان میکانیزمی سیاسەتی رادیکالیزمی سەرمایەداری بە سەرکردایەتی سیستەمی ئەمریکی و نوێنەرایەتی بۆش لە لایەك و ڕادیکالیزمی ئیسلامی بە سەرکردایەتی گرۆ ئیسلامیەکان و نوێنەرایەتی ئوسامە لە لایەکیتر، پێویستە کەمێك باس لەو کلتورەبکەین کە ئەم

میکانیزمانەی پێکهێناوە یان لایەنی کەم ئەو کلتورەی سەرکردەکانی ئەو میکانیزمەی بەرهەمهێناوە، هەروەها ئەو کلتورەی ڕۆشنبیری ئێمە دەیەوێت بۆ داهاتووی بونیاد بنێت. کە بۆخۆی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ باسکردنە لەو میکانیزمانە.

بەختیار عەلی باس لە بەرەبەرەی لێکدابڕانی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا دەکات، بەلام زیاتر نزیك بوونەوەیەك و تێهەلکێشانێکی زۆر مەزن هەیە لەنێوان باکور و باشوردا، خۆرهەلات و خۆرئاوادا. ئەو ڕەخنانەی بۆ گلۆبالیزمی ئیسلامی و سەرمایەداری یان سیستەمی ئەمریکیش لە ئارادان، لە هەردوو لا و لە هەردوو کلتوردا هەیە، بۆ بەتەنها ئێمە باس لە لێکدابڕانی سیاسی نێوان هێزە کردەکان بکەین و بە هۆکاری پەرت بوونیان بزانین؟ بەلکو پەرت بوونی ئەوڕەخنانەو نەبوونی ستراتیژ و ستراکچەر و تیۆریست و بکەری بە مرۆییکردنی ئەو پەیوەندیانە هۆکاری سەرەکیترن و ڕێخۆشکەرن لە بەردەم ئیمپاکتی لێکدابڕانە سیاسی و دەولەتیەکان لەسەر لێکدابڕانی کلتور و شارستانیەتە جیاجیاکانی داهاتووی مرۆڤایەتی کە من پێش بینی جەنگی مەزنتر و لێکدابڕانی مەزنتر دەکەم لەوەی کە هەیە.

زۆر بە پێچەوانەوە خەلك تەواو لەیەکتر نزیك بوونەتەوەو تەنها تەعاروفێك لە نێوان عەقل و ڕۆحیاندا کراوە، ساتی ئەوە نەهاتووە شەڕی عەقل و ڕۆح لەگەل یەکدیدا بکەن، ئەوەی کەماسی تیادا بەدی دەکرێت ئەو تیۆری و کارە عەمەلیە مرۆڤدۆستانانەیە کە ئامادەبوونیان بەدی ناکرێت بۆرێگرتن بە شەڕی نێوان عەقل و ڕۆحە جیاوازەکان. باشترین بەلگەش ئەوەیە کە عەقل و ڕۆحە جیاوازەکان لە بەرامبەر بەرژەوەندی و پیرۆزگەرانەی خۆیان و نەرجسیەتی

دەسەڵاتدا بەهانە بۆ پێکدادان دەدۆزنەوە، کاتێکیش کلتورەجیاجیاکان بەدەر نەبێت لە خەڵکی وەك ئوسامە و بۆش بە دڵنیایەوە گەر هێزێکی هیومانیستی ئاکتیڤ ڕێگە بە هەڵتۆقینی سەرکردەی لەو جۆرە نەگرێت ئەوا چالاکانە ئەوانە نوێنەرایەتی کلتورەکانیان دەکەن و مێژووی کلتورەکانیان دەڕەنگێنن و دەنووسنەوە. بەلامەوە سەیرە کە بەختیار عەلی پێی سەیر بێت، ڕەهەندی کلتوری و ئەخلاقی لاوازتر بێت چونکە هەمیشە ئەو ڕەهەندانەی تر، ئابووری و سەربازی و تەرفیهی، کەرەستەی ماددین و لەگەڵ گۆڕاندا وەك قارچك هەڵدەتۆقن کە لە بنەمادا هۆکاری سەرەکی هەڵتۆقینی گۆڕانەکانن. بەڵام ڕەهەندە کلتوری و ئەخلاقیەکان بە خێراو بە تەکنیشنەکان نایەتە گۆڕاندن.

گەر بگەڕێینەوە سەر واقعی خۆمان و پەرەگرافێکی بەختیار عەلی کە دەڵێت (*هەموو ڕۆشنبیرێك لە جەوهەریدا پرۆژەیەکی چکۆلانەی "دیالۆگی کولتوورو دین و شارستانیەتەکانە" ڕۆشنبیر مانای نیە گەر "فرە کولتوور نەبێت، گەر لەسەر سنووری زیاد لە شارستانیەتێك، ڕۆشنبیریەك، زمانێك هەستێکدا نەژی*).

لێرەدا من بەختیار عەلی تاوانبار دەکەم بە هاندانی نەوەی نوێ بۆ قورتار بوون لە واقعی ئەم پانتاییەی کە پێی دەڵێن کوردستان، لەبری گەشە پێدانی فرەکلتوری و ناساندنی شارستانیەتە جیاجیاکان و زیادکردنی زمانزانی و پێکەوەژیان لە گەڵ هەستەکانی تردا. واقعی ئەمڕۆی ئێمە و بەتایبەت نەوەی نوێ ئەو ڕۆشنبیرە فرەکلتورە درووست ناکات بە میکانیزمی دوورکەوتنەوە و هەناردنی خواستەکانی ڕۆشنبیر بۆ دەرەوە، لەوانەیە پێم بڵێیت مەبەستم ئەوە نیە، بەڵام کاریگەری ئەو ڕستانەو پەراوەکردنی کاری عەمەلی خۆت ئەوەی لێ بەرهەم دێت. لە کاتێکدا لە سیستەمی خوێندنی وڵاتی ئێمەوە مرۆڤی کورد بە سانایی ناتوانێت فرە زمان بێت، ئەی ڕۆڵی ڕەخنەگرتنی سلبی تەنها ڕێگایە بۆ

چاکردنی سیستەمی زمانزانی یاخوود هاندانی چوونەدەرەوە ڕێگاچارەیە بۆ پێکەوەژیان لەگەڵ زمانەکان و کلتورەکان و هەستەکانیتردا، یان ڕۆڵی ڕۆشنبیری فرەکلتور ئەوەیە چۆن کاریگەرانە پەراوەی عەمەلی و پرانسیپی مەتنقی لەم وڵاتەدا درووست بکات بۆ گوشار خستنەسەر دەزگاکان بۆ بەگەڕخستنی توانای زیاتر بە هەمان شێوەش بۆ بوارەکانیتر. خەمی ڕۆشنبیری هاوشێوەی بەختیار عەلی لە چوونە دەرەوە و قسەکردن لەسەر ناوەوە تەنها لە خۆپەرستی مەعریفیانەوە هاتووە لە هەڵپەدا بۆ زانیاریەکان و بینینەکانی ئەودیو سنوور، کاتێکیش قسە لەسەر ناوەوە دەکەن خەمی عاتیفی و خۆسەپاندنی موتلەقگەرایانە و ئەزموونی خۆیان بەسەر خەڵکدا دەکەنە بەڵگەنەویست و حەتمیەتی بە ڕۆشنبیربوونی ڕاستەقینە. لە کاتێکدا ئێمە هەموو باس لە ئازادی و پێگەیاندنی کۆمەڵێك دەکەین کە ئازادی یەکێك بێت لە خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی، لە هەمان کاتدا کلتوری ئێمە تەنها وەك ئاوات سەیری ئەو ئازادیەی کردووە و ژینگەی کۆمەڵایەتیەکەی پڕ بووە لە سەرکوتکردن و پرۆسەی سیستەماتیك بۆ سڕینەوەی ماکی هیومانیستی و خۆش ویستنی یەکدی، پڕ بووە لە مێژوویەك کە سەراپا دژ بە پرۆسەی دەستەمۆکردنی توندڕەویەکانی ناخی مرۆڤایەتین. کەم تازۆر کۆمەڵگای ئیسلامی، و زیاتر زانستیە گەر بڵێین کۆمەڵگاکانی وڵاتە ئابووری دواکەوتووەکان، بە هەمان قۆناغدا تێپەڕیون جا ئەولێکچوونەش کەم بێت یان زۆر.

گەر لە گۆشەکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونیەوە سەیری ژینگەی سەرکردەیەکی ئیسلامی وەك ئوسامە بکەین، ئەوا چەند ڕاستیەك دەبنە هۆی ئەو بەرهەمە، بەڵام بەرنامەکان چین بۆ گۆڕینی ئەو ژینگەیە بە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونی زانستی تر تا لە پاشەڕۆ

چەندین ئوسامە و ئوسامۆکە یان بۆش و بۆشۆکە نە لە کۆمەڵگای ئێمە و نە لە هیچ کۆمەڵگایەکدا دروووست نەبێت. سەرەڕای ئەمانە هەمووی ئوسامە و بۆش کوڕێکی زیندووی کلتوری خۆیانن، بە نمونە ئوسامە ڕێگایەکی زۆر ئاکتیف و بگۆڕی گرتووەتە بەر بۆ پەراوەکردنی ئەو بیرۆکانەی باوەڕی پێیەتی، لە هەمان هاوکێشەدا ستراکچەر و ستراتیژی ئەو بیرۆکەیەش توانیویەتی دیاردەیەك بخاتەوە کە چەندین بەرهەمی وەك ئوسامەی هەبێت بەسوود وەرگرتن لە پێکهاتە شەڕانگێزی و شەڕانگێزیە پەرەپێدراوەکان لە سەرجەم پێکهاتە سروشتیەکانی مرۆڤایەتیدا.

سەرەنجامی کێشەی خێزانی و چەند ژنی باوکی ئوسامە و نزیکی لە کەسایەتیە ئیسلامیەکان بەتایبەت لە کاتی حەجدا و دەوڵەمەندی و توانای ئابووری ئەو خێزانە، ئوسامەیەکی دروووستکرد، بیروڕای چەند ژنی لە لا نەسڕیەوە، بیرۆکە سیاسیەکانی ئیسلامی پێ نەخستە ژێر پرسیارەوە، لەدەرەوەی وڵاتی خۆیدا کاری کرد بۆ گلۆبالیزەکردنی بیرۆکەکەی. هەموو تواناکانی خستەگەڕ بۆ سەرخستن و بەرەوپێش بردنی پرۆسەکانی ئەو ڕێبازە. ئەوەش تەکنیك و شێوازێکی ئاشکرای کارکردن بوو بە ڕیتمێکی دیاریکراو بۆ ئەو مەبەستە، هەرچەند لە ڕووی تەکنیکی و سەربازیەوە ئەو بەرەنگار بوونەوەیە ڕێبازێکی ڕۆمانسی بەرەنگار بوونەوەی ئایدۆلۆژیایە بەرامبەر تەکنەلۆژیا.

لەسەردەمی گلۆبەلایزەیشندا جیهانێك نەما ناوی خۆرهەلات و ئەویدی ناوی خۆر ئاوابێت، جیهان بۆ خۆی هەنگا و بەرەو فرەکلتوری دەنێت. کەرەستەکانی ئەمڕۆی پەیوەندی و بازاڕەکانی ئەمڕۆی دونیا و سەرچاوەکانی زانیاری باشترین گەواهی دەدەن لەسەر ئاوەلابوونی دەرفەت بۆ فرەکلتوری و گفتوگۆی

کلتوره جیاجیاکان. بەڵام ئەوەی ئاستەنگە لە بەردەم گفتوگۆ و ئارگیومێنتی کلتوره جیاوازەکاندا بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیە لە بەگەڕ نەخستنی ئەو سەرچاوانە لەپێناو پێکەوە ژیانی ئاشتیانەو هیومانیستیانەی خەڵکی کۆمەڵگا جیاجیاکاندا تا بتوانرێت وەك هەموو قۆناغێکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی سوود لە دەرفەتەکانی سەردەمی خۆی وەربگیرێت. بە پێچەوانەوە ئەدگارە غەریزیەکان زاڵ بوون بەسەر بەکارهێنانە عەقڵی و مەنتقیەکاندا، ڕۆشنبیر و هزرمەندەکانیش لە نێوان بەکارهێنانی ئەو خەڵکە و مەبەستەکانی دەسەڵات و ڕادیکالیزمی سەرمایەداری و ئیسلامیدا هەنگاوی زۆر بەکاربراو و ناکاریگەریان هەڵگرتووە لەو پێناوەدا.

دەسەڵاتی سیاسی پێویستە کاریگەری ڕۆشنبیرەکان و پسپۆڕەکانی لەسەر بێت بۆ بەرهەمهێنانی پاشەڕۆژێك کە خودی خۆیان خەونی پێوەدەبینن، ئەمەش لە دەسەڵاتەوە بۆ دەرەوەی دەسەڵات ناکرێت، بەڵکو لە دەستەهەڵبژاردەکانەوە ئەنجام دەدرێت بۆ حاکم و حکومکراوەکانی کۆمەڵگا، چونکە هەردوو حاکم و حوکمکراوەکانیش نەوەی کلتوری خۆیانن، ئەو کلتورەش سەرئەنجامی کاری ئەو دەستەهەڵبژاردانەوە قوربانیەکانیان بەرەو ئاقارێکی هیومانیستی یان ئەنتی هیومانیستی گەشەدەکات. ڕاستە ئەو دەستە هەڵبژاردانە ئەمڕۆ لە سەردەمێکدا دەژین لە هەموو توێژەکانیتر زیاتر پاوانکراون، لەکاتێکدا ئەرکی ڕزگارکردن لەو پابەندیەش هەردەکەوێتە سەرخۆیان.

دەسەڵاتەکان بەبێ دەستەهەڵبژاردەکان هەمیشە وەك کوێرێکی بێ گۆچانن، کۆمەڵگا و کلتورەکانیش هەمیشە وەك ئاوێکی مەنگن کەر

دەستەهەڵبژاردەکانی کاریگەر و ئاکتیڤ نەبن، لەکاتێکدا بەفەڕی ئەم کارلێکە کۆمەڵایەتیە ئەو دەستەهەڵبژاردانەبن، ئەوا لە تێکچوونی هاوکێشەکاندا سەراپا ئەو دەستانە تاوانەکانیان دەکەوێتە ئەستۆ.

جارێکیتر دەڵێم ئەمە بەرگری نیە لە هیچ کام لەو دوو حیزبە گەورەیەو لە هیچ کام لە حیزبە کوردستانیەکانی تر چونکە من هیچ کارم بەهیچ کام لەو حیزبانەوە نیە بەدەر لە گەشە پێدانی کۆمەڵی وڵاتەکەم، بەڵام لە چوارچێوەی فاکتەرە جۆراوجۆرەکانی هێزدا لەسەر ئاستی ناوچەکە و جیهان، لەسەر ئاستی ناوخۆ، ئەوە توانای کوردە، کاتێك ڕۆشنبیرەکان یان ئەوانەی بەمافی خۆیانی دەزانن بەشداری سیاسەت یان گوتاری سیاسی بکەن، کەی هەوڵیاندا کاریگەریان هەبێت وەك دەسەلاتێکی مەعریفی بوێر؟ کەی هەلوێستی جودایان پیشاندا لە دەرەوەی دامەزراوە حیزبیەکان؟ کە توانیان ڕۆڵی پڕ زانیاری و پراکتیکی ئەکتیڤ ببین وەك سیاسەتمەداری بێلایەن؟ ئەوا هاوکێشەکان پارسەنگەکانیان جودا دەبێت لەوەی ئەمڕۆ کە هەیە بە ئاقارێکی زانستی باشتردا.

بەڵام ئەوە توانای سیاسی و تەکنیکی سیاسی سیاسەتمەداری کوردە لەو قۆناغە و لەو بارودۆخەدا. هەرگیز من ئەوە ناخەمە ژێر ڕەخنەوە کە چەند پارتە سیاسیەکانی کورد بۆ سازش لە گەڵ ئەم دوژمن و ئەو دوژمندا دەکەن، ئەوەندەی دەستە هەڵبژاردەکان دەخەمە بەر ڕەخنە کاتێك هەڵدێن لە بەرپرسیارێتی، کاتێك هەڵدێن لە بەرامبەر بەشداریکردن لە ئەرکی گۆڕاندا، کاتێك ناتوانن ئەوان بەشداری ڕاستەقینەی سیاسیانەی خۆیان بکەن لەسەر ئاستی ناوخۆیی نەخوازەلا بە حاڵی تێگەیشتنی سیاسیان لە بارودۆخەکانی

ناوچەیی و جیهانی و دەرفەتی باش بوونی باری ژیانی خەڵك لە کوردستاندا. کەسێکی ڕۆشنبیر و هوشیار ناتوانێت چاوپۆشی لە تاوانەکانی یەکێتی و پارتی بکات بەرامبەر شەڕی ناوخۆ و بەدحاڵی بوونی کوردی، بەڵام ئەم تاوانبارکردنە ناخوازێت بیرێك لە هەلومەرجە بابەتیەکان بکەینەوە؟ ناخوازێت چەند دەکرێت ئیمە بە ئەرکی خۆمانی بزانین بۆ ڕێگرتن بەو فاکتەرانە؟ بەڵام کاتێك ڕۆشنبیر نا هوشیار بوو تەنها خەریکی سەفەستەو ڕەخنەی سلبی بوو، تەنها و تەنها موتعەی لە کەمکردنەوەی خەڵك بینی، لەهەمان کاتدا خودی ڕۆشنبیر نەیتوانی ڕاستەوڕاست کاراکتەرێکی بەهێز بێت بۆ ڕێگرتن بە چەوتیەکان، ئەوا دیارە پێویست ناکات بوودەڵەیی ڕۆشنبیر و بیریارەکانی خۆمان بە کەم و کورتی خەڵك پاساو بدەینەوە.

بەختیار عەلی کاتێك باس لە شەڕانگێزی کۆمەڵگای کوردی و حیزبە سیاسیەکانی دەکات، وەك کەسێکی نامۆ بەم کۆمەڵگایە پێناسەی ئەو کلتور و دیاردانە دەکات کە لە کوردستاندا بەرقەرارە، نەبوونی زانیاری یان وێڵ بوون لە زانیاری سیاسی ئەم دیاردەیەی نامۆبوون درووست دەکات لای بەختیار عەلی و ناچاری دەکات ڕەشبینی خۆی بکاتە موتڵەقگەرایەکی جوانکراو و بەسەر خەڵکان و خوێنەراندا پراکتیزەی بکات. نەبوونی خوێندنەوەیەك بۆ دیاردەیەکی وەك تیرۆر لە دنیادا و لە کوردستاندا بە بیانووی ئامادەباشی کلتوری تیرۆر، کارێکە تەنها و تەنها لە بەرەی دژ بە هیومانیستی دەوەشێتەوە یاخود ڕاسترە بڵێین فکری بەختیار عەلی دەچێتە خزمەت ئەو تاقمەوە و وەك سەربازێکی گومناو کاری بۆ دەکات. جا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ نامۆ بوونی بەختیار عەلی لەنێوان عاتیفەی ڕۆژهەڵاتی و عەقڵی ڕۆژئاواییدا یان بۆ هەرەس هێنانی بەختیار عەلی، لەبەر نەکوژانەوەی هیواشی ڕای ڕۆشنبیرێکەوە من ناچمە ئەو

وردەکاریەوە، بەڵکو تەنها ئەوەندە دەڵێم: بەر لە تاوانبار بوون دەکرێت بواری پیاچوونەوە هەبێت، کاتێك نامۆبوون ئەم کارەمان پێ ئەنجام دەدات، ئەوا باشتر وایە خۆمان لە نامۆ بوون دەرباز بکەین نەبادا بکەوینە خزمەت ستراتیژەکانی نامۆ بوونەوە، خۆ ئەگەریش هەرس هێنانە ئەوا بەختیار عەلی گەر نەتوانێت لە بواری سیاسیدا جێدەستی دیار بێت لە بواری ئەدەبدا دەکرێت بەرهەمی باشی هەبێت. بەڵام پاساو بۆ پرۆسە و ستراتیژی تاوان چی جیاواز ناکات لە گەڵ خودی تاواندا.

گەر بێینە سەر بابەتی دەرباز بوون لەم گێژاوانە، ئەوا چەند پرسیارێکی هەمەجۆر دێتە ئاراوە کە دەکرێت هندێکیان بخەینە بەر باس: ئایا خۆ دەربازکردن لە ترس و توندڕەوی بەکێ دەکرێت؟ بە بزووتنەوە مرۆڤدۆستەکان کەناتوانن دەسەڵاتیان هەبێت؟ ئایا کێ دەتوانێت دەسەڵات بگرێتە دەست؟ ئایا دەبەنگەکانی بواری سیاسەت چەندێك جوانیش بن دەتوانن بەو ڕەوتەی ئێستا و دێر زەمانیانەوە ببنە هێزی بکوڕ؟ ئەوە خەڵکی خۆی دەوێت! لەمێژەوە مرۆڤدۆستەکان نەیان توانیوە ببنە سیستەم و دەسەڵات، کە ئەمە بابەتی پیاچوونەوەیەکی جددی ترە، ئەگەرچی وەك تاکیش باڵا دەست بووین نەیان توانیوە ببنە سیستەم و کاریگەری درێژخایەن بەجێ بهێڵن. ئەو دەستکەوتە جوانانەی کە مرۆڤایەتیش بەدەستی هێناون، دەگەڕێتەوە بۆ ئازایەتی و بوێری و جەختی مرۆڤدۆستەکانی ناو جەنگەڵی دەسەڵاتی سیاسی و باندە حیزبیەکان لە دوونیادا. بەڵام ئەوانەی کەتەنها ڕەخنەگر و شوێنکەوتووی دیاردەکان بوون و نەیانزانیوە تەکنیکە سیاسیەکانی سەردەم بەکاربهێنن تەنها لە کتێبخانە ستۆکەکاندا هزریان بەجێماوە کە کەمینەی سەردەمی دیکتاتۆریەتی سەرمایە دەیانخوێنێتەوە بۆ دیموکراتیزەکردنی ژیانی سیاسی لە

پێناو بەکاربردنی هەندێك لە ڕستەکانیان لە پێناو ئەو بەرژەوەندیەدا کە هەیانە، ئەوەی لەسەردەمی نیولیبرالیزمدا بەوان براوە ئەوەیە کە لەمەو پاش توانیویانە نوسراوەکانیان لەسەر دیسکیش بپارێزن، یان ئەوەی لە ئیسلامی سیاسی بووە بە میرات تەنها تەصەوف و گۆشەگیری خانەقا تاریکەکانیان بوون، زۆر ئاژاکانیشیان بە فۆبیایەکی زۆرەوە و بە دەست بەسەردا هێنانی هەموو چواردەورەکانی گوتارێکی بێ هیوا دەخاتە بەردەم نەوەکانی نوێ.

بێتوانایی هاتنە پێشەوەی مرۆڤدۆستەکان و نەبوونی کەرەستەی پراکتیکی بۆ پێشەنگی کردن ئافەرین لەو تێزانە دەکات کە هاتوونەتە پێشەوەو ئەوانیش مێژوو دروست دەکەن. خەون بینین بە تەنها بەس نیە بۆ تێکشکاندنی ئەو ئیرسە درێژانەی کۆن.

فەنتازیای پۆلیسەکان واقع و ژیانی ڕۆژانەیە، بەڵام فەنتازیای شاعیرەکان خەونی قۆزاخەخواردوو و ستاتیکایەکی بەکاربراوی سیستەمە سیاسیەکانی خۆیانن، من زۆر بەگەرمی دەستخۆشی لەو پۆلیسە دەکەم کە دەتوانێت دڵسۆزانە فەنتازیای خۆی بخاتە خزمەت ئەو دەسەڵاتەوەکە باوەڕی پێیەتی یان موچەی لێوەردەگرێت، هەروەها زۆر لە فەنتازیای ئەو شاعیرەش شادمانم کەدەتوانێت جەوهەرو ستاتیکایەکی هەست هەژێن بۆ ڕەوتێکی بگۆڕ بخولقێنێت گەر هەڕەمەکی نەبێت و لە خزمەت پرۆسەیەکدا بێت. ئەوەی تۆ باسی ناکەیت و ناتەوێت ببیتە بەرپرسیار بەرامبەری نەبا دا هەڵەتکردبێت ئەوەیە کە چۆن فەنتازیای پۆلیسەکان بە دیدی مرۆڤدۆستەکان خۆشەبکرێت کە چۆن فەنتازیای شاعیرەکان هەستی پۆلیس و تیرۆریستەکانیش ڕاچەنێنێ، نەك بەتەنها بۆ ئەو هاوکێشانە بگری کە خۆی نەیتوانیوە شیکاریان بکات،

تەنها بە لاوانەوە ئەدەبیە خەمهەژێنەکان منی بەرژەوەندی خوراو بۆ خەمەکانی خۆی بگرێنێت.

لە غیابی ڕۆشنبیرەکان و مرۆڤدۆستەکاندا لەسەر گۆڕەپانی سیاسی هەروەها لە دەبەنگی کاری سیاسی ئەو توێژەدا و قۆزاخەخواردوویی ئەو کۆمەڵە پۆزەتیڤە تیۆریەدا، دەست خۆشی لە بەرەی جەهل و زولم دەکەم کە ئەوەندە بەسەلیقەو شەیتان بن بتوانن خەونەکانی تۆ تێکدەشکێنن، چونکە تازە وا ئەو شێوازەش بووە بە موتلەقێك کە ڕۆڵی قەڵغان ببینێت بۆ تۆتالیتاریەتی ئەوان. دواجاریش خەمۆکی و گریانەکانیان کە نەوەکانی نوێ بەرەو هەڵدێرگە دەبات، دەمخاتە شکەوە کە دەسکردی ئەوان بن وەك دەزگا ئیعلامیە ئیستهلاکیەکان، یان ئەوانەی بۆ تەنفیسی فشاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری درووست دەکرێن لە ڕۆژئاوادا و لە ڕۆژهەڵاتدا وەك تیۆری دەخوێندرێن و وەك تەکنیك چێژیان لێدەبینرێت.

ئەی کوا ئەو براوە شەریفەی کە پێویست بوو بەر لەم قەیرانانە ئامادەیی هەبێت، منیش دەڵێم: هەموو چارەسەرێکی ئەفسانەیی جگە لە تراژیدیای گەورە هیچی تر بەرهەم ناهێنێت، بەڵام ڕەشنووسی ئەو ئەفسانەیە لە لای ڕۆشنبیرەکانەوە هاتووە و بەرەی تاریکستانیش دەرهێنەری تراژیدیا کانن.

سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(١) دەباغ، فەیسەڵ، ئینسکلۆپیدیای ئابووریی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، ٢٠٠١.

(٢) گەر تێبینی بکەین شەڕی جوندولئیسلام لە کوردستاندا سەرئەنجامی ئەو پرۆسەی کار و کاردانەوەیە نیە کە باسی لێدەکەین، چونکە زۆر هێزی دەرەکی لە پشت ئەم بزووتنەویەوە بەدی دەکرێت و زادەی پێویستیە واقعیەکانی ئەم ژینگەیە نیە یان لایەنی کەم دید و دروشمەکانیان زۆر نامۆن بە خواستی ناوچەکە.

(٣) بەکار هێنانی وشەی کرێکار و ژن مەبەست لە کەمکردنەوەی ڕۆڵی کرێکار و ژن نیە بەڵکو مەبەست لە گرنگی ڕۆڵی ئەو ڕێپێوانە بوو کە ئەنجامیان دا، واتە ئەم ڕستەیە بەواتای کرێکارێتی و سەرکاری یان ژنێتی و پیاوێتی بەکار نەهاتووە هەرچۆن بەتەنها مەبەستم لە بەختیار عەلی نیە سەبارەت بەو بابەتە.

(٤) کورد هەوڵی نەداوە سوود لە ئیسلام وەربگرێت بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی ئیسلامی کوردی، وەك ئێران، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی،...هتد. بەڵکو کورد وەك پێکهاتەیەکی ئاینی کۆمەڵایەتی سەیری ئیسلامی کردووە لە ناو پرۆسە کۆمەڵایەتیەکانیتردا. ئەمەش وایکردووە کە ئیسلام وەك ڕاوێژکارێك بەکاربهێنێت بۆ شەرعیەت دان بە مافە نەتەوایەتیەکانی، کە لە ڕاستیدا ئەمە ڕەخنە نیە لە چۆنێتی بەکارهێنانی ئیسلام لە لایەن کوردەکانەوە ئەوەندەی ڕوونکردنەوەیە بۆ جەختکردن لەسەر نوێ بوونی بزووتنەوە ئیسلامیەکان وەك بزووتنەوەی سیاسی لە کوردستاندا.

(٥) مولوي حفيظ الله حقاني، طاليبان من حلم الملا الى امارة المؤمنين،

(٦) اسلام اباد: معهد الدراسات السياسية، ١٩٩٧.